# ڕۆژئاواییەکان

# چییان لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەوێت؟





کۆکردنەوەو ئامادەکردنی

کاروان ڕشید محی الدین

د. عبدالواحد محمد سالح پێشەکی بۆ نووسیوە



| | |
|---|---|
| نـــــــاوی کتێـــــــب | ڕۆژئاواییەکان چییان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەوێت؟ |
| کۆکردنەوەو ئامادەکردنی | کاروان ڕشید محی الدین |
| پێـشەکی وخوێندنـەوەی | د.عبدالواحد محمد سالح |
| پێداچـــــــــوونەوەی | لیژنەیەك |
| هەڵەچـــــــــــــن | عومەر محمد زەڵمی |
| تایـــــــــــــــپ | ڕیاز مەحموود کاکە مەحموود |
| نـەخـــشەسازی نـــاوەوە | کۆمپیوتەری نارین (محمد علی) |
| نـــۆرەو ســـاڵی چـــاپ | یەکەم ٢٠١٢ز |
| ژمــــــارەی ســـپاردن | ژمارە سپاردنی (١١٥٣)ی ساڵی ٢٠١٠ی پێدراوە |

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

website:www.nareenpub.com

E-mail: info@nareenpub.com

nareenpub@gmail.com

تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)

مۆبایل: ٠٠٩٦٤ ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

# ڕۆژئاواییەکان

# چییان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەوێت؟


کۆکردنەوەو ئامادەکردنی

کاروان ڕشید محی الدین


د.عبدالواحد محمد ساڵح پێشەکی بۆ نووسیووە


ناریـن

## پێشەکی بە پێنوسی بانگخواز

د.عبدالواحد محمد سالح

مانەوە و بەردەوامی هەر گەلێك بەندە بەڕێزگرتن لـە بـەها ئاینیـەکانی خۆی،لەبـەر ئەوە چەندە سەرسـەختی و سەرپێچی بەرامبـەر بـە پـەروەردگار و ڕێبازەکـەی زیـاتر بوو بێت، ئەوا زووتر سزاو تووڕەیی خوایان بۆخۆیان شایستە کردووە، تەماشاکەن! بـە درێژایی مێژوو لـە قەومـە باسـکراوەکانی قورئانـەوە تـا ڕوسـیای ڕوو سـیا، ئـەمڕۆش ئـەوروپا ڕووبـەڕوی قـەیرانێکی گـەورەی دارایـی دەبێتـەوە، لـە ئـەنجامی سـنوور شکاندنیان بەرامبەر بە پیرۆزیەکانی ئاین و پێغەمبەران.

باشە خۆ موحەممەدەکەی ئێمە(ﷺ) (رحمة للعالمين)ە ، خۆ ئـەو خۆشەویستەجگە لە زوبانی ڕاستەوخۆی بانگەواز شتێکی دیکەی بۆ ڕۆژئاواییەکان پێ نەبووە .

باشە ئەگەر ئەمە ئازادی ڕادەربڕینـە، کەنیسە چـەند لـەم سوکایەتیانە بـۆ عیـسا (علیـە الـسلام) قبـولْ دەکـات .ئەگـەرنا خـۆ پێغەمبـەر (ﷺ) لـە مەزەنـدەی ئەوانـدا کەسـێکی مـردووە و شـەیتانیش دەسـتی لێهـەڵگرتووە .ئەگـەر ڕۆژئـاوا دەربەسـتی پێغەمبەری خۆیان عیسی (علیە السلام) بوونایە،ئەوا نەدەبوو ئابەم شێوەیە بە جوێن و ناوونـاتۆرو کاریکـاتێرو..........پێغەمبـەری ئیـسلامیان ئیهانـە بکردبـا ، لەکاتێکـدا دەزانن کە زیاتر لە ملیارێك شوێن کەوتوی هەن ، ئەگـەر خـاوەنی هـیچ نـەبن خـاوەنی زمانێکی تیژو زبرن کە دەکرا تا قسەیەك بە پێغەمبـەرمان (ﷺ) بـدەن لـە بەرامبـەردا ئێمە سـەدجوێن لـە جێگـەیدا بـە موقەددەسـاتی ئـەوان بدەین , بـەڵام دیارە ئـەوان دەربەستی موقەددەسات و پێغەمبەری خۆیان نـین ، یاخود دەزانـن ئێمـەی موسـڵمان هـەموو پێغەمبـەران (علیـە الـسلام ) بـە مـوڵکی خۆمـان دەزانـین بـەبێ جیـاوازی، لەبەرئەوەیـە تەنانـەت بـەبیری موسـڵمانێکدا نـەهات کـە بەشـێوازی خۆیـان وەڵامیـان بداتەوە !

ئەگەر ئەم سوکایەتیانەی ئەوان ئازادی بیروڕایشە، ئەوە دەبوو ئەو سوکایەتیە بە موساو و یەعقوب و ئیسحاق و پێغەمبەرانی تریش بکەن .

تەنانەت بودا گایەکیش لە هندستان دەپەرسترێت ،بەڵام سودێك لە باسی ئەمانەدا دەبینێت لە کاتێکدا ئەمانە هیچ جۆرە ترسێکیان بۆ ئەوروپا دروست نەکردووە، ئەوان باش حاڵین کە ئەوەی ئەمرۆ بەڕاستی دەکرێت میراتگری شارستانیەتەکەی ئەوان بێت تەنها شوێنکەوتوانی (ﷺ) ن و بەس ،کەڕۆژانە بە بەرچاویانەوە دەیان کەس پەنجەی شایەتیان بەرز دەکەنەوە، بە (اشهد ان محمدا رسول الله) کە پێشتر هەمان ئەو پەنجەی سەبابەیان بۆ جوێندان سەربەرەو خوار دەکردەوە و ئێستا لە شایەتی حەقدا ئاماژەی بەرزی و ئاسمانی پێ دەکرێت ،بەڵێ ئا ئەمەیە کە ئەوروپای تۆقاندووە،لەئامێزگرتنی لەڕادەبەدەری تاکی ڕۆژئاوایی بۆ ئیسلام کەنیسەکانیشیانی بێنازخستون ! لە ناچاریدا بە موسڵمانانیان دەفرۆشنە وە تا زەرییەی ئاو وکارەبایان لەسەر کەڵەکە نەبێت ! بۆیە هەرچەند ئەوانە ئەو جوێن و نوسینانە بوروژێنن ئەوە زیاتر هاونیشتمانیانی خۆیان هان دەدەن کە بەدوای ڕاستی کەسایەتی (ئەحمەد) دا وێڵ بن! کە مرۆڤی ژیرو زاناش ڕاستی ئیسلامی بۆ دەرکەوت ،ئیدی گوێ لە قسەی هەرزەو بەیت وبالۆری ڕاگەیاندن ناگرێت .

(انا كفيناك المستهزء ين) واتە: ئێمە ئەی محمد (ﷺ) ئێمە گاڵتە پێکەرانت لە کۆڵ دەکەینەوە .

بەڵێ ئێمە دان بەوەدا دەنێین کە کاڵاو پێشکەوتنمان لە ڕۆژئاواوە بە دەست دەگات ،بەڵام ڕۆژو ڕوناکی دەبێت لە ڕۆژهەڵاتەوە بەهرەمەندمان بکات ، ڕۆژئاواش ئەگەر بیەوێت ڕۆژی ئاوانەبێت پێویستە لە زووترین دەرفەتدا خۆی بە ئاینەکەی (ﷺ) ی ڕۆژهەڵاتی مونەووەر بکات تا لە ئاوابوون ڕزگاری بێت!

لە کۆتادا سوپاس و دەستخۆشی خۆم ئاڕاستەی برای بەڕێزم (م.کاروان رشید) دەکەم،کە ئەرکی کێشاوەو ئەم کتێبە زیندوەی ئامادە کردووە،بەئومێدم زیاتر خۆی

بۆ خزمەتکردنی ئەم ئاینە یەکلا بکاتەوە،هیوادارم پێنوسەکەی زیاتر کاریگەر بێت بەئاڕاستەی خزمەت کردنی ئیسلام و موسڵمانان.

لەگەڵ ڕێزدا

د.عبدالواحد محمد سالح

٢٠١١/١/٢٠

# بەشی یەکەم

## پێگەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ )

**لەم تەوەرانە پێك دێت:**

* **پێگەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەلای خوای گەورە**
* **پێگەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەلای هاوەڵان**
* **پێگەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەلای ئوممەتەکەی**
* **پێگەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەلای بوونەوەرانی دی**

# پێگەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەلای خوای گەورە

## پێگەی پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) لەلای خوای گەورە:

لای هەمووان ڕوون و ئاشکرایە تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەرمان (ﷺ) زۆرن، ئەو هەموو تایبەت مەندیە، بەو شێوە کۆکراوەییە نەدراون بە هیچ پێغەمبەرێکی تر.

مایەی خۆشحاڵیە ئەم تایبەتمەندیەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) لەلایەن زانایانەوە ئاماژەی پێکراوە و، چەندین کتێبیان لەو بوارەدا داناوە.

بەورد بوونەوەو تێڕامانمان لە قورئان و سوننەت، بە ئاشکرا تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەری نازدارمان(ﷺ) بۆ دەردەکەوێت، پێگەی خوا (ﷺ) لە ئاینی ئیسلام دا، وە تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەر، کە بێ گومان ئەمە پانتاییەکی گەورە و فراوانی داگیر کردووە، پشت بە خوا لەم بەشەی ئەم کتێبەدا ئاماژە دەکەم بە (پێگەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) لەلای خوای پەروەردگار).

## یەکەم: موعجیزە گەورەو سەر سووڕهێنەرەکە کە قورئانی پیرۆزە:

قورئان فەرموودەو وتەی خوای پەروەردگارە (جل جلالە) کە دایبەزاندووە بۆ سەر بەندەی خۆی موحەممەد (ﷺ)، هەتا بکرێتە دەستووری ژیان و ڕێ ڕۆشن کەرەوە بێت بۆ خەڵکی و، لەتاریکی ڕزگاریان بکات بەرەو ڕۆشنایی و ڕێنمونی خوایی، بەڵێ ئەم ئایەت و موعجیزە سەرسوڕهێنەرە تایبەتمەندکراوە بە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ، قورئان و تایبەتمەندیەکانی دەتوانین لەم خاڵانەدا کورت بکەینەوە:

١- خوای گەورە بەڵێنی پاراستنی ئەم قورئانەی داوە لە هەر گۆڕین و کەم کردن و زیادکردنێك وەك دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجر: ٩.

واتە: بەڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووەو بەدڵنیاییەوە، هەر ئێمەش پارێزگاری لێ دەکەین. !

بەڵێ لەو ساتەوە قورئانی پیرۆز دابەزیوە، بەردەوام دوژمنانی ئیسلام لە هەوڵی شێواندن و دەستکاری کردنی قورئاندا بوون ، لەم هەوڵەشیان کوڵ نادەن. ! پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی ڕێگەی پێ نەداون تەنانەت پیتێکیش لە قورئان بگۆڕن.

بە دڵنیلییەوە قورئان گەورەترین نیشانەو بەڵگەو موعجیزەیە کە دەیسەلمێنێت بۆ هەموو جیهان: بەڵێ (محمد ﷺ) بەڕاستی پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

٢- ئەم موعجیزە گەورەیە تا ڕۆژی دوایی دەمێنێتەوە، وەك بەچاوی خۆمان دەبینین ئێستا لەناوماندایەو لەم سەردەمی کوفرو فەساددەدا! ئەو تاکە چرای ڕێ ڕۆشن کەرەوەی موسڵمانانەو، بەهۆیەوە باوەڕداران دەتوانن پەرە بە ئایینی ئیسلام بدەن و لەسەر بانگەوازی تاقانە پەرستی بەردەوام بن.

٣- ئەم قورئانەو پاراستنی لەلایەن خوای پەروەردگارەوە هۆکارێکی گرنگە لە بۆ زۆری ئەو کەسانەی شوێن پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکەون و باوەڕی پێ دەهێنن، هەروەك لە صەحیحی بوخاری دا هاتووە کە ئەبوو هورەیرە دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

(مامن الأنبياء نبي الا أعطي ما مثله آمن عليه البشر، وانما كان الذي اتيته وحيا أوحاه الله إلي، فأرجوا ان أكون اكثرهم تابعا يوم القيامة).

واتە: هەرچی پێغەمبەرێك هەیە شتێکی هاوشێوەی پێدراوە کە خەڵکی باوەڕی پێهێناوە، ئەوەش کە بە من دراوە وەحیەکەو لەلایەن خواوە بۆم نێردراوە،ئومێدەوارم کە زۆرترین شوێن کەوتووم هەبێت لە ڕۆژی دواییدا.

٤- موعجیزەکانی قورئان زۆرو هەمەچەشنن وەك:

أ- موعجیزەکانی قورئان لەڕووانگەی دەرخستن و بەلاغەو ڕەوان بێژییەوە.

ب- ئەو موعجیزانەی کە تایبەتمەندن بە هەواڵ دان سەبارەت بەو ڕووداوانەی کە هێشتا ڕوویان نەداوەو لە داهاتوودا ڕوو دەدەن.

ج- ئەو موعجیزانەی باس لە یاسا دانان و ئەحکامەکانی دەکەن.

هەورەها چەندین موعجیزەی تریش لە قورئانی پیرۆزدا بوونیان هەیە کە لێرەدا بواری باس کردنیان نییە،هەمان کات زانست و تەکنەلۆژیای نوێ باشترین شاهیدن لەسەر موعجیزەکانی قورئان.

٥- خوای پەروەردگار ئەم قورئانەی کردووەتە پێشەنگ و گەورەی هەموو کتێبە ئاسمانییەکانی ترو، بەهۆی ئەم قورئانەوە هەموویانی نەسخ کردووەتەوە.

## دووەم: پێغەمبەرایەتی ( پەیام ) کۆتایی پێهێنەری پێغەمبەران:

ئەمەش لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێ کراوە، وەك:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿...وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُۚ وَكَانَ فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ عَظِيمٗا ﴿١١٣﴾﴾ النساء:١١٣.

واتە:...خوای گەورە قورئان و دانایی بۆ دابەزاندوویت و فێری ئەو شتانەی کردوویت کە جاران نەتدەزانین، بەردەوامیش فەزڵ و ڕێزی خوا لەسەر تۆ (ئەی موحەممەد) (ﷺ) زۆر بە فراوانی و ئاشکرایی دیارە.

هەروەهاخوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ﴿٤٦﴾﴾ الاحزاب: ٤٥، ٤٦.

واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئێمە بەڕاستی تۆمان ڕەوانە کردووە کە شایەت بیت بەسەر ئوممەتی ئیسلامەوەو ،موژدە بەخش بیت بۆ ئیمانداران و ترسێنەری کافران بیت، هەروەها بەمۆڵەت و یارمەتی خوا بانگەواز دەکەیت بۆ بەرنامەو ڕێبازی ئەو زاتە، هەمان کات چرایەکی ڕووناك کەرەوەی بۆ سەرجەم سەرگەردانان.

بەڵگەش سەبارەت بەوەی پێغەمبەرمان (ﷺ) کۆتایی پێهێنەری بانگەوازی پێغەمبەرانە،وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ۝٤٠ ﴾ الاحزاب: ٤٠.

ئیمامی (ابن کثیر) لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: "ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پاش پێغەمبەری خۆمان (ﷺ) هیچ پێغەمبەرێکی دیکە نایەت، ئەگەر لە پاش پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێغەمبەری تر نەیەت، ئەوە بێ گومان (الرسول) لە پێشترو شایستە ترە لە (النبی)، چونکە پێگەو مەقامی (الرسول – نێردراو) گشتگیرترە لە پێگەو مەقامی (النبی–پێغەمبەر)،وەپێویستە بزانین هەموو نێردراوێك پێغەمبەرە، بەڵام هەموو پێغەمبەرێك نێردراو نییە."

ئەگەر سەیری فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بکەین و بە چاوی دڵ لێیان ورد ببینەوە ،دەبینین لە زۆرێك لە فەرموودەکانیدا ئاماژەی بەوە داوە ،کە ئەو پێغەمبەری ئاخیر زەمانەو پاش خۆی هیچ پێغەمبەرێکی تر نایەت، هەمان کات هۆشداری ئەوەیشی داوە کە لە پاش خۆی چەندین پێغەمبەری درۆینە سەر هەڵ دەدەن،کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن،پێغەمبەری نازدار (ﷺ) بە پەرۆشەوە ئوممەتەکەی لە شەڕو فیتنەی ئەمانە ئاگادار کردووەتەوە هەتا خۆیان بپارێزن و گومڕا نەبن.

چەندین بەڵگە دەیسەلمێنن کە پێغەمبەرمان (ﷺ) کۆتایی پێ هێنەری هەموو پێغەمبەرانەو پاش ئەو هیچ پێغەمبەرێکی تر نایەت، لە گرنگترینی ئەو بەڵگانەش:

١– مانەوەو پارێزراوی ئەو ئاین و بەرنامەیەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هێناویەتی، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە ئەم ئاینە بۆ هەموو کات و سەردەمێك گونجاوەو گشتگیرە بۆ هەموو گرۆهی ئادەمیزاد.

٢- ئەو ئاینەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هێناویەتی پێشەنگی هەموو ئاینە ئاسمانیەکانەو،هەموو پێغەمبەران پشتگیری بەرنامەکەی دەکەن و هەمان کات نەسخ کەرەوەی گشت ئاینە ئاسمانیەکانیشە.

## سێیەم: گشتگیری پەیامەکەی کە تایبەتە بە هەموو جیهان:

یەك لە تایبەتمەندیە گرنگەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەیە کە ئەو نێردراوە تا ڕێ ڕۆشن کەرەوە بێت بۆ هەموو جیهانیان بە مرۆڤ و جنۆکەوە.

سەبارەت بەوەی کە پێغەمبەرمان (ﷺ) پێغەمبەری پەرییەکانیشە، ئەمە لە سوورەتی (الجن) دا ئاماژەی پێکراوە، وەك خوای گەورە دەفەرموویت:

﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾﴾ الاحقاف:٢٩.

واتە: یادی ئەوەش بکە کاتێك ئێمە دەستەیەك پەریمان لادایە لای تۆ، تا گوێ لە قورئان بگرن، ئەوسا ئامادە بوون و بە یەکترییان وت گوێ بگرن و بێدەنگ بن، کاتێك قورئان خوێندنەکە تەواو بوو، پەرییەکان گەڕانەوە بۆ ناو هۆزو قەومەکەیان دەستیان کرد بە ئاگادارکردنەوەو بانگ کردنیان بۆ پەیڕەوی کردنی ئەم ئاینە نوێیە.

هەروەها دەفەرموویت: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾﴾ سباء: ٢٨.

واتە: ئێمە تەنها بۆ هەموو خەڵکی نەبێت تۆمان ڕەوانە نەکردووە، لەکاتێکدا مژدەدەرو ترسێنەر بیت بۆیان، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستیە نازانن.

هەروەها دەفەرموویت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾﴾ الانبیاء: ١٠٧.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) لە چەندین فەرموودەدا ئاماژەی کردووە بەوەی کە ئەو بۆ هەموو گرۆهی ئادەمیزاد نێردراوە، وەکو دەفەرموویت: (وبعثت إلى الناس كافة).

واتە: من بۆ هەموو خەڵکی نێردراوم.

پێویستە هەموو گەل و ئوممەتەکانی تر لە جوولەکەو گاورو بت پەرستان،ئەو ڕاستیە بزانن کە هیچ ڕێگەیەکیان لە بەردەم دا نیە جگە لە شوێن کەوتنی ئاینی ئیسلام ! وەك دەبینین ڕۆژانە پەیتا پەیتا شوێنکەوتووانی ئەو ئاینانە،واز لە ئاینی باب و باپیرانیان دەهێنن و شوێن ئاینەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکەون.

بێگومان لێرەوە چەند ڕاستەقینەیەکمان بۆ دەردەکەوێت:

١- ئەوانەی وا گومان دەبەن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تایبەتە بە عەرەبەکانەوە، ئەمە تەنها بانگەشەی دوژمنانی ئیسلامە! ئاشکرایە بەم بانگەشانە تەنها خۆیان دەخەڵەتێنن! چونکە ئەوە بەڵێن و موژدەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە ڕۆژێك دێت ئەم ئاینە بە هەموو جیهان دەگات و تەنانەت شەو و ڕۆژ بگاتە هیچ شوێنێك ئاینی تاقانە پەرستیشی پێ دەگات، وەك دەفەرمووێت: (ليبلغن هذا الأمر ما بلغ الليل والنهار...).

ئایا ئەمە بەس نییە تا بڵێین پێغەمبەری ئاخیر زەمان پێغەمبەری هەموو جیهانە!

٢- ئەوانەی لەم سەردەمەدا وا گومان دەبەن کە ئیسلام تایبەتە بە موسڵمانانەوەو،بانگەشەی ئەوە دەکەن شوێن کەوتووانی ئاینەکانی تر بۆیان نیە بێنە ناو ئاینی ئیسلامەوە، بە هەمان شێوە ئەمەش داوێکە لەلایەن دوژمنانەوە بۆ شوێن کەوتووانی ئاینەکانی تر دانراوە تا لەگەڵ خۆیاندا ئەوانیش بەرەو دۆزەخ ڕاپێچ بکەن، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا موسڵمانان و بەرنامەکەیان بۆ ڕێنوێنی خەڵك نێردراون و، لەو ڕووەوە هیچ جۆرە جیاوازییەکی ئاینی و ڕەگەزی و زمانەوانی لە ئارادا نییەو هەرکەسێك بیەوێت دەتوانێت بێتە ناو ئاینی خواوەو، ئیسلام ئاینێکە بێ گومان جێگای هەموو گەل و نەتەوەیەکی تێدا دەبێتەوە،بە درێژایی مێژووی ئیسلامیمان نابینین کە ڕۆژێك لە ڕۆژان موسڵمانان ڕێگەیان لەموسڵمان بوونی تەنانەت کەسێکیش گرتبێت.

٣- گشتگیری ئەم ئاینە بۆچوونی عەلمانیەکان بەدرۆ دەخاتەوە کە وا بۆ خەڵکی باس دەکەن ئاینی ئیسلام لە ئێستادا ڕۆڵ و کاریگەری کۆتایی پێ هاتووەو،بۆ گومڕا کردنی خەڵکی دەڵێن ئەم ئاینە تایبەتە بە لایەنی پەرستش وبەندایەتی بەندەوەو ،پەیوەندی بە سیاسەت و لایەنەکانی تری ژیانەوە نییە. !

## چوارەم: خوای پەروەردگار ناوی پێغەمبەری (ﷺ) بەسەر ناوی هەموو دروست کراوەکاندا بلند کردووە: هەوڵ دەدەین بە کورتی ئاماژەی پێ بدەین:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴿٤﴾﴾ الشرح: ٤.

واتە: ناو و ناوبانگی تۆمان بەرزو بڵند کردووە، لە شایەتوماندا لەگەڵ ناوی ئێمەدا ناوت دەبرێت.

خوای گەورە بە جوانترین و شایستە ترین ناو، بانگی پێغەمبەری کردووە (ﷺ) وەك (یاایها النبی... یاایها الرسول) ئەمەش ئاماژەیەکی ترەو دەیسەلمێنێت کە پێغەمبەرمان (ﷺ) هەڵبژاردەی ناو پێغەمبەرانیش بووە، ئاشکرایە کە خوای پەروەردگار پێغەمبەرانی تری بەناوی خۆیانەوە بانگ کردووە( یا نوح، یا ابراهیم، یا لوط، یا عیسی....هتد).

٢- خوای گەورە داوا لە موسڵمانان دەکات کە پێغەمبەر (ﷺ) بەناوی خۆیەوە بانگ نەکەن، بەڵکو لەکاتی قسە کردنیاندا لەگەڵ پێغەمبەری نازداردا (ﷺ) پێویستە ئەو دەستەواژانە بە کار بهێنن کە لە قورئاندا باس کراون وەك: (یا أیها الرسول، یا أیها النبی)، وەك دەفەرموێت: ﴿لَّا تَجْعَلُوا دُعَاءَ الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاءِ بَعْضِكُم بَعْضًا...﴾ النور: ٦٣ .

لێرەدا تەفسیری پەسەندتر ئەوەیە کە خوای گەورە داوا لـە موسڵمانان دەکات بـە زمانی قورئان بانگی پێغەمبەر (ﷺ) بکەن،ئەمـەش وەك ڕێزێکـە بـۆ ئـەو پێغەمبـەرە ئازیزە (ﷺ).

٣- خوای گەورە سوێندی خواردووە بە ژیانی پێغەمبـەر (ﷺ) وەك دەفـەرمووێت:

﴿لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿٧٢﴾﴾ الحجر: ٧٢.

ئیمامی (ابن کثیر) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمووێت: سـوێند خـواردنی خـوای گەورە بە ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەیە بۆ ئەو ڕێزو گەورەیی و پایەیە کە خوا بەوی بەخشیوە.

٤- خوای گـەورە لـە گونـاهی پـاش و پێـشی پێغەمبـەرە خۆشەویستەکەی (ﷺ) خۆش بووە، هەروەك لە سەرەتای سوورەتی فەتحدا باسی کردووە.

پێویستە ئاگاداری ئەوەش بین خوای گەورە بـە شێوەیەك نـاوی پێغەمبـەری بڵنـد کردووە،کە بە بەردەوامی ناوی پێغەمبەری بردووەتـە ئاست نـاوی پـیرۆزی خۆیـەوە! بەتایبەت لەکاتی بانگ و قامەت و شەهادەتدا.

هەروەك لە ئەمڕۆماندا ئەو ڕاستیە بەرچاو دەکـەوێت، هـیچ کەسێك لـە جیهانـدا ناگاتە ئاست پێغەمبەر (ﷺ) لەڕووی ڕێزو گـەورەیی و پیرۆزییـەوە، لـە خۆشەویـستی ئەودا، بەردەوام نەوەکانی ئادەم بە موسڵمانان و بـێ بـاوەڕەوە نـاوی (محمد ﷺ) بـۆ نـاو نانی وەچە کانیان هەڵدەبژێرن و، بەردەوامیش ناوی (محمد ﷺ) لە سەر ئاسـتی جیهـان لـە نوێ بونەوە دایەو، سەرباری ئـەو مێـژووە دوورو درێـژەی بـە سـەر کۆچـی دوایـی ئـەو سەروەرەدا تێ پەڕیوە،بەڵام دەبینین ڕۆژ بە ڕۆژ لە سەر ئاستی جیهانی ناوی پـیرۆزی پێشەوامان بڵند تر و خۆشەویست تر دەبێت لەسەر تاسەری دونیادا.

## پێنجەم: خوای گەورە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خۆی پەیوەست کردووە بە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ):

١- لەم بارەوە چەندین دەقی قورئانی پیرۆز ئاماژەیان بەو ڕاستیە کردووە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ ﴿٣٢﴾﴾ ال عمران: ٣٢.

واتە: پێیان بڵێ کە فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەر (ﷺ) بن، خۆ ئەگەر سەرپێچی بکەن و پشتی تێ بکەن، ئەوە دڵنیا بن خوا بێ باوەڕانی خۆش ناوێت.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَا تَوَلَّوْا عَنْهُ وَأَنتُمْ تَسْمَعُونَ ﴿٢٠﴾﴾ الانفال: ٢٠.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی بن و هەرگیز لە بەرنامەی ئەو زاتە پشت هەڵ مەکەن، لەکاتێکدا ئێوە تێدەگەن و دەبیستن.

هەمان کات چەندین ئایەت ئاماژە بەوە دەکەن سەرپێچی کردن لە فەرمانەکانی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) سەرپێچیە لەفەرمانەکانی خوای گەورە ، وەك: دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ...﴾ النساء: ١٤.

واتە: ئەوەی یاخی بێت لەخواو پێغەمبەرەکەی....

هەروەها پێویستە موسڵمانان هاوسەنگی بکەن بۆ دەرنەچوون لە فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) .

بێ گومان دەزانین گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای گەورە، پەیوەستە بە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) ، هەروەك چۆن گوێڕایەڵی پێغەمبەر جێگە ناگرێت، ئەگەر گوێڕایەڵی خوای گەورەی لە گەڵدا نەبێت، هەر کەسێك وا گومان ببات تەنها شوێنی قورئان دەکەوێت و،لەو ڕووەوە پێویستی بەشوێن کەوتنی پێغەمبەری نازدارمان

(ﷺ) نییە، ئەوە درۆزنەو درۆ دەکات؟ چونکە ئەو جۆرە کەسانە خۆیان لە ئاست دەقەکانی قورئاندا کەڕ کردووەو بەو جۆرە بانگەشانە خۆیان و خەڵکانی تریش گومڕا دەکەن، یاخود سەبارەت بەقورئان هیچ شارەزاییەکیان نیە، چونکە قورئان فێرمان دەکات و فێری کردوین کە چۆن شوێن ئەو ڕێبازە پیرۆزە بکەوین ،کەواتە چۆن شوێن قورئانی پیرۆز دەکەوین، بە هەمان شێوە پێویستە شوێن سوننەتی پاکی پێغەمبەریش (ﷺ) بکەوین،بە داخەوە ئەمڕۆ لە ناو لاوە موسڵمانەکاندا، بەتایبەت ئەوانەی بە فەلسەفەی خۆرئاواو شیعە کاریگەرو سەرسام بوون، خەریکە دەبێتە دیاردەو ،بە بیانووی لاوازی فەرموودەوە، هەندێك جار بەبێ زانیاری بەرپەرچی فەرموودەکانی پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) دەدەنەوە، بەدڵنیاییەوە ئەم کارەیان هەڵەیەو، باشتر وایە بگەڕێنەوە بۆ سەر ڕێبازە ڕاستەقینەکەو، خۆیان و خەڵکی تریش دووچاری کوفرو گومان نەکەن، دڵنیام کە زۆربەیان بەدڵ سافی و بێ زانستی خۆیان ئەو بۆچوونەیان لا درووست بوەو ، خۆیان ئەوە لە بەرژەوەندی ئاینەکەمان دەزانن.

٢- ئەم بنچینەو یاسایە دەمان گەیەنێتە چەند ڕاستەقینەیەکی تر، گرنگترینیان:

أ- قەدەغەکردنی دەنگ هەڵبڕین بەسەر دەنگی پێغەمبەردا (ﷺ)، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٢﴾ ﴾ (الحجرات: ٢).

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، لەکاتی قسەکردن وگفتو گۆکردندا دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا (ﷺ) بەرز مەکەنەوەو، قسە بێ پەردە مەکەن لە خزمەتیدا، وەکو چۆن بۆ یەکتری قسە دەکەن، نەوەکو کردەوەکانتان پووچ و بەتاڵ ببنەوەو هەستیشی پێ نەکەن.

ئەمەش هێماو ئاماژەیە بۆ گەورەیی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە (ﷺ) ، ئەگەر ئەم ئایەتە لە ڕوویەکەوە پەیوەندی بەو سەردەمەوە هەبووبێت کە هاوەڵان لەدەوری پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) بوون، ئەوا بێگومان کرۆکی ئایەتەکەو داخوازیەکەی

ئێمەش دەگرێتەوەو، تایبەتە بەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەرەوە (ﷺ)،بێ گومان ئەم ئایەتە بەئێمەی موسڵمان دەڵێت: کە نابێت لە ئاست پێغەمبەر (ﷺ) و، سوننەت و بەرنامەکەیدا دەنگ هەڵبڕین و پێویستە بۆ هەموو فەرمان و ڕێگریەکانی پێغەمبەر (ﷺ) گوێڕایەڵ بین.

ب- قەدەغەیەو ڕەوا نییە بۆ ئێمەی موسڵمان کە لە هیچ فەرمان و ئیجتیهادو بڕیارێکدا پێش خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بکەوین، خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ...﴾ الحجرات: ١.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لەهیچ کارێکی دینی و دونیاییتاندا بە وتە یان بە کردار نەکەن پێش فەرمانی خواو پێغەمبەر (ﷺ) بکەون، بەڵکو وتەو بۆچوون و ئیجتیهادەکانتان دوا بخەن هەتا خواو پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بەو کارە فەرمان دەدەن...

ئەمەش ئاماژەیەکەو ئەوە فێری موسڵمانان دەکات، کە پێویستە ئەدەب و ڕێزو شکۆ لەئاست ئەو پێغەمبەرەدا (ﷺ) دەربڕن و، لەم ڕووانگەشەوە هاوەڵان باشترین نموونەن هەتا بیانکەینە پێشەنگ و سەرمەشقی خۆمان.

ج- لەسەر موسڵمانان پێویستە کە لە کاتی گرفت و کێشەکانیاندا پەنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ببەن و، ئەو بکەنە دادوەر بۆ چارەسەری گرفتەکانیان وەك خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا ٦٥﴾ (النساء: ٦٥).

واتە: نەخێر سوێند بەخوا ئەوانەی لافی بڕواداری لێ دەدەن بڕوا ناهێنن! هەتا لە هەموو کێشەیەکدا لە نێوانیاندا ڕوو دەدات، تۆ نەکەن بە دادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن،

دوای ئەوەش نابێت لە دڵ و دەروونیاندا هیچ ناڕەزاییەك درووست ببێت دەربارەی ئەوەی دادوەریت لە سەری کردووە، دەبێت بە تەواوی تەسلیم بن و ڕازی بن.

٣- خوای گەورە خۆش ویستنی خۆی پەیوەست کردووە بە خۆش ویستنی پێغەمبەرەکەیەوە (ﷺ)، وە ڕەزامەندی خۆی پەیوەستە بە ڕەزامەندی پێغەمبەرەوە (ﷺ)،هەمان کات بەیعەت دان بە پێغەمبەر(ﷺ) وەك بەیعەت دانە بەخوای گەورە،کە لێرەدا لەبەر نەبوونی بوار تەنها ئاماژە بە ئایەتێکی قورئان دەکەین و دەیسەلمێنێت ئەوانەی بەیعەتیان دا بە پێغەمبەر هەمان کات بەیعەتیان بەخوای گەورە داوە، وەك دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ...﴾ الفتح: ١٠.

٤- بە هەمان شێوە خوای گەورە ئازاردانی پێغەمبەری (ﷺ) بە ئازاردانی خۆی زانیوە، وەك دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿٥٧﴾﴾ الاحزاب: ٥٧.

لەمانای ئەم ئایەتەدا ئەوە دەخوێندرێتەوە کە هەر کەسێك ئازاری پێغەمبەر (ﷺ) بدات، ئەوا دەکەوێتە بەر نەفرینی خواو لەدونیاو لەدواڕۆژدا لە ڕەحمی پەروەردگار دوورە، هەروەها لە ئایەتەکەدا ئەو حوکمەش هەڵهێنجراوە کە هەر کەسێك ئازاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدات ئەوا بێ باوەڕ دەبێت و پێویستە بکوژرێت.

٥- پێغەمبەرمان (ﷺ) ڕێزی لێنراوەو پلەی خەلیلی پێ دراوە، کە بێگومان ئەمەش گەورەترین ئاستی ڕێزو خۆشەویستی و دۆستایەتیە،خوای گەورە ئەم ڕێزەی تەنها لە پێغەمبەری خۆمان (ﷺ) و پێغەمبەر ئیبراهیم گرتووەو کردوونی بە خەلیلی خۆی، هەروەها ئەم ڕێزەی پەروەردگار بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە شەوی میعراجدا دەردەکەوێت،کە خوای کاربەجێ لەو گەشتەداقسەی لەگەڵ کردو نوێژی لەسەر ئوممەتەکەشی فەرز کرد.

**شەشەم: پەروەردگار وەسف و ستایشی پێغەمبەری کردووە،هەروەك ئەمەش لە قورئاندا بە ڕوونی دەبینرێت و ئەم وەسف و ستایش کردنانەش جۆراو جۆرن وەك:**

خوای گەورە منەت بەسەر باوەڕداراندا دەکات و دەفەرموویت: ﴿لَقَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ بَعَثَ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ١٦٤﴾ ال عمران: ١٦٤.

واتە: سوێند بێت بێگومان خوای گەورە منەتی کردووە بەسەر باوەڕداراندا! کاتێك لەخۆیان پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردوون و ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوەو، دڵ و دەروونیان پاك و پوخت دەکاتەوە، هەروەها فێری قورئان و داناییان دەکات، بەڕاستی پێشتر لە گومڕاییەکی ئاشکرادا ڕۆ چوو بوون.

هەروەها دەفەرموویت: ﴿لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ حَرِيصٌ عَلَيۡكُم بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١٢٨﴾ التوبة: ١٢٨.

واتە: ئەی خەڵکینە سوێند بەخوا بێگومان پێغەمبەرێکتان بۆ ڕەوانە کراوە کە هەر یەکێکە لە خۆتان، زۆر بەلایەوە سەختە کە ئێوە تووشی بەڵاو ناخۆشی ببن، زۆر بە تەنگیشتانەوەیەو پەرۆشە بۆتان، زۆر دڵسۆزی ئیماندارانەو میهرەبان و دلۆڤانە بۆیان.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ٥٦﴾ الاحزاب: ٥٦.

ئیمامی (ابن کثیر) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموویت: خوای گەورە دەیەوێت سەبارەت بە مەقامی بەندەو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە ئاسمان دا، هەواڵ بداتە ئەهلی سەر زەوی و پێیان ڕابگەیەنێت کە ئەوە پێغەمبەرەکەی ئێوەیە لە ئاسمانەکان داو لەلای فریشتەکان وەسف و ستایشی دەکەم و، فریشتەکانیش سەڵاوات و ڕەحمەتی بۆ دەنێرن، پاشان خوای گەورە فەرمان بە دانیشتووانی سەر زەوی دەکات کە سەڵاوات و

ڕەحمەت بنێرن بۆ ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە (ﷺ)، هەتا سەلاوات و ڕەحمەتی هەردوو جیهان لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) کۆ ببنەوە.

هەروەك لە زۆرێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا( ﷺ) ئامـاژە کـراوە بـە گـەورەیی سەلاوات دان لەسەری، لە فەرموودەیەکدا کە ئەبوو هورەیرە دەیگێڕێتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (من صلى علي صلاة واحدة صلى الله عليه بها عشرا).

واتە: هەر کەسێك سەلاواتێکم لەسەر بدات، ئەوا خـوای گـەورە دە جـار سـەلاواتی لەسەر دەدات.

هەروەها زانایان دەفـەرموون: سـەلاواتدانی خـوای گـەورە لەسـەر بەنـدەی بـەواتای ڕەزامەندی دێت.

## حەوتەم: خوای گەورە ڕێزی لە ئوممەتەکەی پێغەمبەر ( ﷺ ) گرتووە:

ڕێزگرتنەکانی خوای گەورە بۆ پێغەمبەر زۆرن و لەژماردن نایەن، لەبەر خاتری ئەو پێغەمبەرە نازدارە ﷺ پەروەردگار ڕێزی لە ئوممەتەکەشی گرتووەو، نیعمەتانێکی زۆری بەسەردا ڕشتوون، کە بە چەندین تایبەتمەندی لە ئوممەتانی تر جیا دەکرێنەوە. لە گرنگترین ئەو ڕێزانەی کە لە ئوممەتەکەی نراوە، وەك:

١- چاکترینی ئوممەتانن کـە دەرچـووبن بـۆ ڕێنمـونی خـەڵکی، خـوای گـەورە لـەم بـارەوە دەفـەرمووێت: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ...﴾ ال عمران: ١١٠.

واتـە: بەڕاستی ئێـوە چاکترین ئوممـەتێکن کـە بـۆ سـوودی خـەڵکی هێنراونەتـە مەیدانەوە، چونکە فەرمان بە چاکە دەکەن و قەدەغەی خراپەش دەکەن و باوەڕی دامەزراو بەخوا دەهێنن....

٢- خوای گەورە ئوممەتەکەی بەمیانەڕەو(وسط) ی ئوممەتان ناو دەبات، وەك دەفەرمووێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ...﴾ البقرة: ١٤٣.

**لەم ئایەتەدا بۆمان دەردەکەوێت کە:**

أ- ئەم ئوممەتە بەردەوام مامناوەند بووەو، خۆی لەو سرووشتەی ئوممەتانی پێشوو پاراستووە(افراط-تفریط) ،کە بێگومان ئەمە بووە هۆکاری لەناوچوونی ئوممەتانی پێشوو.

ب- خوای گەورە ئەم ئوممەتەی ڕێزدار کردووە بەوەی کە لە ڕۆژی دواییدا دەبنە شاهێد بەسەر خەڵکییەوەو، شاهێدی دەدەن کە پێغەمبەرەکانیان پەیامی خوایان پێ گەیاندوون.

ج- بە هەمان شێوە پێغەمبەریش(ﷺ) لەڕۆژی دواییدا دەبێتە شاهید بەسەر ئوممەتەکەیەوە سەبارەت بە گەیاندنی پەیامەکەی خوا پێیان.

لە گەڵ ئەوەی ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە نزیکی کۆتایی دونیادا هاتووە بەڵام لە قیامەتدا یەکەمین ئوممەتن، وەك لە فەرموودەکاندا ئاماژەی پێ کراوە.

هەمان کات لە پێشی ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەسەر ئوممەتەکانی تردا چەند لایەنێك دەگرێتەوە:

أ- لەپێش هەموو درووستکراوەکاندا ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) دادگایی دەکرێت وەك لە فەرموودەدا ئاماژەی بۆ کراوە: (نحن الآخرون من اهل الدنيا الاولون يوم القيامة المقضى لهم قبل الخلائق).

واتە: ئێمە کۆتا ئوممەتی دونیاو یەکەمین ئوممەتی ڕۆژی دوایین، کەپێش هەموو بونەوەرەکانی تر دادگایی دەکرێین.

ب- پێغەمبەر (ﷺ) و ئوممەتەکەی پێش هەمووان بەسەر پردی (صراط) دا تێ دەپەڕن، وەك لە صەحیحی موسلیم دا هاتووە: (ويضرب الصراط بين ظهري جهنم فأكون أنا وأمتي اول من يجيز).

واتە: پردی (صراط) لەسەر دۆزەخ دادەنرێت ،من و ئوممەتەکەم یەکەم کەسانێکین بەسەریدا دەپەڕینەوە.

ج- ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) یەکەمین ئوممەتن کە دەچنە بەهەشتەوە، وەك دەفەرمووێت: (ونحن اول من يدخل الجنة).

واتە: ئێمە یەکەمین ئوممەتین کە دەچینە ناو بەهەشتەوە.

**خوای گەورە کۆمەڵە خەڵاتێکی پێشکەشی ئەم ئوممەتە کردووە کە بە هیچ پێغەمبەرو ئوممەتێکی تری نەداون وەك:**

أ- مانگی پیرۆزی ڕەمەزان.

ب- شەوی ڕێز لێگیراو (ليلة القدر).

ج- ڕۆژی هەینی.

د- مزگەوتی (حەڕام) و مزگەوتی پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ) لە مەدینە، هەروەك دەزانین نوێژ کردن لەو شوێنانەدا تایبەت مەندی و پیرۆزی خۆی هەیەو، هەمان کات دەجال ناتوانێت بچێتە شاری مەککەو مەدینەو قودسەوە.

هـ- دابەزینی عیساو حوکم کردن بە قورئان و شوێن کەوتنی پێغەمبەری خۆمان (ﷺ).

لە کۆتاییدا دەگەینە ئەو ڕاستیەی ئەم پێغەمبەرە (ﷺ) بەندەو نێردراوی خوایە بۆ ڕێنموونی خەڵکی، پەیامەکەشی ئەوە بە مرۆڤەکان دەڵێت: پێویستە ئەوان وەك مرۆڤ بژین و لە سنووری مرۆڤی خۆیان نەچنە دەرەوە، هەروەها پێویستە ئەو ئەرکانەی لەسەر شانمانە سەبارەت بەو پێغەمبەرە ئازیزە (ﷺ) جێ بەجێیان بکەین،هەمان کات نابێت لە ئاستیدا زیادە ڕۆیی بکەین و، ناکرێت ئەو بەرز بکەینەوە

بـۆ ئاسـتی ئولوهییـەت، هـەروەها ناشـبێت بـەهیچ شـێوازێك لەپلـەو پایـەی ئـەو پێغەمبەرە (ﷺ) بهێنینە خوارەوە،پێویستە بزانین کە باوەڕ بەخوا هیچ سوودمان پێ ناگەیەنێت ئەگەر هەمان کات باوەڕ بە پێغەمبەر (ﷺ) نەهێنین و شوێنی بەرنامەکـەی نەکەوین، چونکە خوای گەورە خۆی ئەو پێغەمبەرە نازدارەی (ﷺ) بەسەر هەمواندا بڵند کردووە.

## پێگەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەلای هاوەڵان

قسەکردن سەبارەت بە پێگەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەلای هاوەڵان سنورێکی بەر فراوانی هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا هەوڵ دەدەین سەبارەت بەم بابەتە بە کورتی ئاماژەیەك بکەین، بەڵێ بە درێژایی مێژوو هیچ کەسێك نەبووە بە وێنەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەلای هاوەڵانی خۆشەویست بووبێت، ئەو لەدڵی هەموو ئوممەتەکەیدایەو، ئەم خۆشەویستییەی پێغەمبەریش (ﷺ) لەو ڕاستییەوە سەرچاوەی گرتووە،بەوەی کە بەڵێ ئەو پێغەمبەر وسەرداری مرۆڤایەتییەو،بەڕاستی شیاوی ئەوەیە کە هەموو مرۆڤایەتی بەچاوی ڕێزو گەورەیی و خۆشەویستییەوە سەیری بکەن، ئەگەر لە ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) وفەرموودەکانی ورد ببینەوە، ئەوا چەندین ڕووداوی سەرسوڕ هێنەرمان لەو بارەیەوە بەر چاو دەکەوێت!

خوای گەورە یارو پەنامان بێت، هەوڵ دەدەین لەم بەشەدا بەجیا سەبارەت بەم تەوەرەیە قسە بکەین.

بێ گومان خوای گەورە لە سەر ئەم ئوممەتەی پێویست کردووە، باوەڕ بەو پێغەمبەرە مەزنە (ﷺ) بهێنن و شوێنی فەرمانەکانی بکەون و شکۆو ڕێزی لەئاستدا بنوێنن.

وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ٨ لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ٩﴾ (الفتح: ٨، ٩).

هەمان کات خوای گەورە لە چەندین ئایەتی تردا فەرمان بە موسڵمانان دەکات، شوێن پێغەمبەرەکەیان (ﷺ) بکەون و بە گەورەو سەرداری خۆیانی بزانن، شتێکی ئاشکرایە پێویستە ئێمەی موسڵمان پێغەمبەرمان (ﷺ) لە هەموو شتێکی تر خۆشتر بووێت، جارێکیان ئیمامی عومەر(ڕەزای خوای لەسەر) دەفەرمووێت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، تۆم لە هەموو شتێك خۆشتر دەوێت جگە لە نەفسی خۆم، پێغەمبەریش

(ﷺ) دەفەرمووێت: باوەڕت تەواو دانامەزرێت، هەتا منت لە نەفسی خۆیشت خۆشتر نەوێت، پاشان ئیمامی عومەریش دەفەرمووێت: ئێستا تۆم لە نەفسی خۆم خۆشتر دەوێت، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاماژە دەدات بە دامەزراوی و تەواوی باوەڕەکەی.

**لێرەدا بەکورتی ئاماژە بە پێگەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکەین لەلای هاوەڵان.**

**یەکەم: زۆر خۆش ویستن و تامەزرۆیی هاوەڵان بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ):**

لەو بارەیەوە عروەی کوڕی مەسعود لەپێش موسڵمان بوونی دا، دووچاری سەرسوڕمان دەبێت کاتێك دەبینێت پێغەمبەر (ﷺ) چەندە لای هاوەڵەکانی خۆشەویست و ڕێزلێگیراوە و پێشبڕکێ دەکەن بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی و، تەنانەت پاش ماوەی ئاوی دەست نوێژەکەی بەپیرۆز سەیر دەکەن و! لە جەستەی خۆیانی دەسوون و دەیخۆنەوە.؟ عروە بەردەوام چاوی بڕیوەتە چۆنیەتی ڕەفتاری هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ)، پاشان عروە دەڵێت: سوێند بەخوا تەنانەت هاوەڵان خەریك بوو دەبووە شەڕیان لەسەر تفی دەمی پێغەمبەرو وەك ( تبرك ) لە دەم و چاو و جەستەی خۆیانیان دەسوو، ئەگەر فەرمانێکی بکردایە دەست بەجێ جێ بەجێیان دەکرد خەریك بوو لەسەر ئاوی دەست نوێژیەکەی شەڕیان دەبوو، ئەگەر قسەی بکردایە بەبێ دەنگی گوێیان بۆ دەگرت، بەچاوی ڕێزو شکۆوە دەیان ڕووانی بۆی، پاشان عروە دەگەڕێتەوە بۆ لای قورەیشیەکان و پێیان دەڵێت: سوێند بەخوا وەك نوێنەر سەردانی کیسراو قەیسەرو نەجاشیم کردووە، هیچ پاشایەکم نەبینیوە بە ئەندازەی موحەممەد (ﷺ) ڕێزلێگیراو بێت لەلایەن هاوەڵەکانیەوە!

هەروەها عەمری کوڕی عاص وەسفی پێغەمبەر (ﷺ) دەکات و دەفەرمووێت: پێغەمبەرم (ﷺ) لە هەموو کەس لەلا خۆشەویستر بووە ، هەرگیز چاوم لەدیتنی پێغەمبەر (ﷺ) تێر نەبوە، ئەگەر یەکێك سەبارەت بە سیفەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

پرسیارم لێ بکات، توانای وەسف کردنیم نییە.! چونکە چاوەکانم لە بینینی ئەو تێر نەبوون.

یەکێکی تر لەو نموونانەی کە بەڵگەی خۆش ویستن و ڕێزگرتنی پێغەمبەر (ﷺ) دەسەلمێنێت لەلای هاوەڵان ئەوەیە، هەرکاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لەکۆڕو مەجلیسێکدا ئامادەیی هەبووبێت ،ئەوا ئارامی و هێمنی باڵی بەسەر ئەو مەجلیسەدا کێشاوەو، بەشێوازێك خۆیان لە جووڵە خستووە وەکو ئەوەی باڵندە بەسەر سەریانەوە بێت.!

هەروەها بەرائی کوڕی عازب دەفەرمووێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەرچووین بە مەبەستی ناشتنی هاوەڵێکی ئەنسار، پاش ئەوەی لە ناشتنی بووینەوە پێغەمبەر (ﷺ) دانیشت و، ئێمەش لە دەورو پشتی دانیشتین بەشێوازێك وەك ئەوەی باڵندە لەسەر سەرمان نیشتبێتەوە!

سەبارەت بە خۆشەویستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەدڵی ئافرەتانی موسڵماندا، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص باس لەو ئافرەتەی هۆزی بەنی دینار دەکات ،کە براو باوك و مێردەکەی لە ئوحوددا شەهید بوو بوون و، پاش ئەوەی هەواڵی شەهید بوونی کەسەکانی پێ درا.! دەست بەجێ پرسیاری لە بارەی تەندروستی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کرد، کاتێك سەلامەتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بۆ دەرکەوت، وتی: مادام پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ژیاندا مابێت کارەساتەکە بچووکە!

بەڵێ ئەمە بوو هەڵوێستی هاوەڵان لە بەرانبەر پێغەمبەری خۆشەویست دا (ﷺ) ، ئافرەتێك بە جارێك سێ تەرمی بۆ ڕەوانە دەکرێتەوە، بەڵام لەبەر گەورەیی و خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) تەرمی سێ شەهیدەکەی خۆی لەبیر دەچێتەوەو، پرسیار لە بارەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەکات کەبۆی دەردەکەوێت پێغەمبەر (ﷺ) سەلامەتە، ئیتر لە ئاست کارەساتەکانی خۆی دا ئارام دەگرێت و سوکنایی بۆ دێت، چونکە هاوەڵان باش لەو ڕاستیە گەیشتبوون کە قوربانی دانی ئەوان و شەهید بوونیان لەپێناو ئەم ئاینەدا هەم ئاینەکە بەهێز دەکات و هەم بەهەشتیش بۆ خۆیان

مسوگەر دەکەن، بەڵێ لەناو چوون و شەهید بوونی پێغەمبەر (ﷺ) لەلای هاوەڵان واتە: دووبارە گەڕانەوە بۆ ژیانی نەفامی و خەفە بوونی ئاینی تاقانە پەرستی ! لەپاش ئەوەی کە بەم ئاینە سەربەرز کران.

تەنانەت هاوەڵان ئەوەندە تامەزرۆی پێغەمبەر بوون (ﷺ)، هیوایان خواستوەو بەئومێد بوون لەو دونیاش دا لە خزمەتی ئەم پێغەمبەرەدا بن (ﷺ) و لێی دوور نەکەونەوە، ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) چاوی بە هاوەڵێك دەکەوێت بەناوی (قەزبان) کە زۆر لاوازو بێتاقەت دەهاتە پێش چاو.! پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرمووێت:(قەزبان) ئەوە چیتە بۆ ئەوەندە لاوازو بێتاقەتی؟ نەخۆشی ! یان برسیتە.؟!

(قەزبان) یش لە وەڵامدا دەفەرمووێت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نە نەخۆشم و نە برسیمە.! بەڵکو گرفتێکم بۆ درووست بووە، من تۆم زۆر خۆش دەوێت، تەنانەت تۆم لە خۆم و ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامانەکەم خۆشتر دەوێت، بەڵام کاتێك من لەتۆ دوور دەکەومەوە بەردەوام لەماڵەوە یادی تۆ دەکەم و دڵم سوکنایی نایەت هەتا پێت شاد دەبمەوە و دێمەوە خزمەتت، وە کاتێك بیر لە مەرگی خۆم و بەڕێزت دەکەمەوە بۆم دەردەکەوێت کە تۆ لە بەهەشتدا لەگەڵ پێغەمبەراندا لە (عیللیین)ـدا دەبیت، منیش ئەگەر بچمە بەهەشتەوە دەترسم بە خزمەتت نەگەم و ئیتر چاوم پێت نەکەوێت.؟ ئەمە پەژارە گەورەکەمەو منی لەڕو لاوازو بێ هێز کردووە، ئیتر جبریل بەم ئایەتەوە هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾﴾ النساء: ٦٩.

واتە: ئەوەی فەرمانبەرداری خواوو پێغەمبەر (ﷺ) بکات، جا ئەوانە لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەبن لە(بەهەشت) دا کە خوا نازو نیعمەتی ڕژاندووە بەسەریاندا،

لەپێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان، ئای کە ئەوانە هاوڕێ و هاودەمێکی چاك و بێ وێنەن.

هەروەها لەڕۆژی (صفین) دا عەمماری کوڕی یاسر تا شەهید بوو،بەردەوام ئەم درووشمەی دووبارە دەکردەوە: ئەمڕۆ بە پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی شاد دەبمەوە.

بیلالی خۆشەویستی پێغەمبەریش (ﷺ)، لەکاتی سەرەمەرگدا بوو خێزانەکەی هاواری کرد، ئای لەو کارەساتەی دووچارمان بووە، بیلال فەرمووی بڵێ وای لەو خۆشییە.؟ سبەینێ دەمرم و بەدیداری خۆشەویستەکانم شاد دەبمەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانن.

هەروەها عەبدووڵڵای کوڕی عەبباس لەکاتی نەخۆش کەوتنی عائیشەدا مژدەی ئەوەی پێدا کەوادەی شاد بوونەوەی دایکی ئیمانداران (عائیشە) بەپێغەمبەر و هاوەڵان نزیکە، وەکو دەفەرمووێت:

سوێند بەخوا مژدە بێت لە گەڵ جیابوونەوەی جەستە و ڕۆحەکەتدا، هەموو ئازارەکانت نامێنن و بەپێغەمبەرو هاوەڵان دەگەیتەوە. ئاشکرایە ئەو نەخۆشییە هۆکار بوو تا عائیشە کۆچی دوایی بکات و بەخۆشەویستانی شاد ببێتەوە.

## دووەم : ئامەزرۆیی هاوەڵان بۆ جیانەبوونەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) و، گوێ گرتن لێی و ئامادە بوون لە کۆڕو کۆبوونەوە کانیدا :

کاتێك هاوەڵان بە پەرۆشەوە پەلاماری ئاوی دەست نوێژو، مووی سەری دەدەن و بە پیرۆزییەوە لەئامێزی دەگرن، ئەوە بێ گومان سوورترن و زیاتر پێداگری دەکەن، هەتا لە کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەردا (ﷺ) ئامادە بن و، گوێ بۆ فەرموودەکانی بگرن، تەنانەت ئەوەندە ئامەزرۆی کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەر (ﷺ) بوون، وشە بە وشە فەرموودەو وتە شیرینەکانی ئەویان بۆ ئێمە گواستووەتەوە و، وەکو چۆن لەزاری پیرۆزی هاتوونەتە دەرەوە،بەو شێوازە بۆئێمەیان بەجێ هێشتوون.

بەڵێ بەدڵنیاییەوە ئەگەر زۆر تامەزرۆیی هاوەڵان نەبووایە، بۆ گوێ گرتن و پاشان گواستنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ نەوەکانی پاش خۆیان،هەرگیز ئەم سامانە گەورەو زۆرەی فەرموودەی پێغەمبەر نەدەگەیشتە ئێمە، پێویستە بەردەوام نزای خێر بۆ هاوەڵان بکەین! چونکە ئەم دینە بە هەوڵ و ماندوو بوون و خوێن وجیهادو ئارەقەی ئەوان بەدەست ئێمە گەیشتووە، هاوەڵان ئەوەندە تامەزرۆی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، هەوڵیانداوە پیت بە پیت فەرموودەکانی بگەیەننە ئێمە،بەدڵنیاییەوە هەر وتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) شیاوی ئەوەن بەو شێوە وردەکاریەوە بگوازرێنەوە ! چونکە هیچ کات لەخۆیەوەو بەبێ هۆ قسەی نەکردووە، کە قسەشی کردووە ڕاستەوخۆ مەبەستەکەی پێکاوەو گوێ گرەکەش تێیگەیشتووە، خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ (٤)﴾ النجم: ٣، ٤.

عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب باسی تامەزرۆیی ئیمامی ئەبووبەکرو عومەر دەکات بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، کە زۆرترین کات هەردووکیان هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوون و بەردەوام پێداگر بوون هەتا پێغەمبەر (ﷺ) ئەوان لەگەڵ خۆیاندا ببات و هاوڕێ و پارێزەری بن، هەروەها پێشەوا عەلی بەردەوامە لە وتەکانی و دەفەرمووێت: وا گومان دەبەم کە زۆرترین کات گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بووە کە فەرموویەتی: (ذهبت أنا وأبوبكر وعمر، ودخلت أنا وأبوبكر وعمر، وخرجت أنا و أبوبكر وعمر...).

هەروەها عومەری کوڕی خەتتابیش زۆر پێداگری کردووەو، تامەزرۆ بووە هەتا لە کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەردا (ﷺ) بەردەوام ئامادە بێت، گوێ گرتن لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) گرنگترین شت بووە بەلای ئیمامی عومەرەوە، ئەگەر لەبەر بژێوی و ناچاری نەبووایە ئەوا هەرگیز حەزی نەدەکرد بچێتە بازاڕ بۆ ئەوەی لەپێغەمبەرەکەی (ﷺ) دوور نەکەوێتەوە. !

ڕۆژێك ئیمامی عومەر بۆ کاری بازرگانی چووە بازاڕی مەدینە،ئەو ڕۆژە ئیمام عومەر بە بەردەوامی و ناو بەناو چەندین جار گەڕایەوە مەجلیسەکەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) ، هەتا بە جوانی ئاگاداری وەحی و گۆڕانکاریەکان بێت. !

ئەبوو هورەیرەش لەسەر خۆی پێویست کردبوو، کە لە پێغەمبەر (ﷺ) جیا نەبێتەوەو ڕێگەی نەدەدا کە ژیان دووچاری دابڕانی بکات لە پێغەمبەر(ﷺ)، حەزی دەکرد سکی برسی بێت بەڵام لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) بێت، ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) نانی بخواردایە لەگەڵی دەخواردو ئەگەریش برسی بووایە، ئەویش برسی دەبوو! بەڵێ ئەبوو هورەیرە بەو شێوازە لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) ژیانی گوزەراند !هەتا لە هیچ سوننەتێکی پێغەمبەر(ﷺ) بێ ئاگا نەبێت.

سەبارەت بە تامەزرۆیی ئەو هاوەڵانەی کە شوێنی نیشتەجێ بوونیان زۆر دوور بووە لە مەدینەوە،ئەوە بەبێ گومان هیچ کات دووری وڵاتەکەیان نەبووەتە ڕێگر بۆ شاد بوونیان بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، هاوەڵی وا هەبووە لەناکاو کێشەیەکی بۆ دروست بووەو، وا پێویستی کردووە کە حوکمە شەرعییەکەی لەزاری پێغەمبەرەوە (ﷺ) گوێ لێ بێت، ڕاستەوخۆ خۆی بۆ سەفەر ئامادە کردووە، ڕێگەیەکی زۆر دووری داوەتە بەر هەتا بە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتووەو پێویستییەکەی بۆ جێ بەجێ کردووەو، دواتر گەڕاوەتەوە بەرەو وڵاتی خۆی! هەمان کات بڕینی ئەم ڕێگە دوورو درێژەو ماندوویەتی سەفەری بەلاوە گرنگ نەبووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوان گەیشتنە خزمەت پێغەمبەریان (ﷺ) بەلاوە مەبەست بووەو لەو پێناوەدا ئامادەی هەموو جۆرە قوربانی دانێك بوون.

هەروەها ئافرەتە سەحابییەکانیش لەم بوارەدا لەپیاوان کەمتر نەبوون و ئەوانیش زۆر تامەزرۆی پێغەمبەر بوون،هەتا لە نزیکەوە ئاگادارو شارەزای ئاینەکەیان بن و بەهرەمەند بن لە خزمەت ئەو پێغەمبەرە ئازیزەدا (ﷺ).

ڕۆژێك ئافرەتانی مەدینە سکالای خۆیان بردە لای پێغەمبەر (ﷺ)، سەبارەت بەوەی کە پیاوان مەجلیسی پێغەمبەریان کۆنترۆڵ کردووەو! بوار بە ئافرەتان نادەن هەتا بێنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، وە داوایان لە حەزرەت کرد ڕۆژێك تایبەت بکات بە ئافرەتانەوە هەتا بێنە خزمەتی و لە نزیکەوەو لەزاری پێغەمبەرەوە (ﷺ) شارەزای ئاینەکەیان ببن، لەوە بەدوا پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێکی بۆ ئافرەتان تەرخان کرد لەگەڵیاندا کۆ دەبوویەوەو ئامۆژگاری دەکردن و لە ئاین شارەزای دەکردن.

هەروەها ئافرەتان ئەگەر کێشەیەکیان بۆ بهاتایەتە پێش سەردانی ماڵی پێغەمبەریان دەکردو پێغەمبەریش (ﷺ) بەخۆشحاڵیەوە وەڵامی پرسیارەکانی دەدانەوەو داواکانیانی جێ بەجێ دەکرد.

## سێهەم: بەرگری کردنی هاوەڵان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ):

پێغەمبەر (ﷺ) لەلای هاوەڵان زۆر گەورەو خۆشەویست بووە، لەبەر ئەوە مایەی شانازییان بووە کە ببنە پارێزەری (ﷺ) و لەڕێی ئەو دا بکوژرێن، ئەمە دروشمی هاوەڵان بووە بەرامبەر ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە (ﷺ) (فداك بابائنا وأمهاتنا يا رسول الله) .

## نموونە زۆرە سەبارەت بە بەرگری کردنی هاوەڵان لە پێغەمبەر(ﷺ) وەك:

لەگێڕانەوەیەکی بوخاری دا لە عروەی کوڕی زوبێرەوە هاتووە دەفەرمووێت: وتم بە عەمری کوڕی عاص هەواڵم بدەرێ لەبارەی توندترین کاری موشریکانەوە کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) کردبێتیان،ئەویش لەوەڵام دا وتی: کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ژووری کەعبەدا نوێژی دەکرد، عوقبەی کوڕی ئەبی موعیت هات، کراسەکەی ئاڵاند لە ملی پێغەمبەر(ﷺ) و توند گرێی دا، ئەبووبەکر پەیدا بوو هەردوو شانی عوقبەی گرت و لەپێغەمبەری دوور خستەوەو فەرمووی: ئایا ئێوە پیاوێك دەکوژن کە دەڵێت تەنها (الله) پەروەردگارمە.؟!

ئەوە فاتیمەی کچیەتی بەرگری لە باوکی کردووە لەکاتێکدا لەلایەن بێباوەڕانی قوڕەیشەوە ئازار دەدرێت، ئیبن مەسعوود دەفەرمووێت: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەناو کەعبەدا خەریکی نوێژ کردن بوو، ئەبوو جەهل و هاوڕێکانی دانیشتبوون، هەندێکیان بەوانی تریان دەگوت کێ دەتوانێت پاشەڕۆی ئاژەڵ بهێنێت و لەکاتی سوژدەدا بیخاتە سەر پشتی (محمد) ، تاوانبار ترین کەس بەو کارە هەستاو پاشەڕۆی ئاژەڵی هێنا ! کە ئەویش عوقبەی کوڕی ئەبی موعیت بوو، چاوەڕێی کرد هەتا پێغەمبەر (ﷺ) سوژدەی بردو پاشماوەی ئاژەڵەکەی لەنێوان هەردوو شان و پشتی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ) دانا،منیش سەیرم دەکرد بریا دەسەڵاتم هەبووایە، پاشان ئەبوو جەهل و تاقمەکەی دەستیان کرد بە پێکەنین و بەدەم گەمەو گاڵتەوە بەلای یەکتریدا لار دەبوونەوە، هێشتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سووژدەدا بوو سەری بەرز نەکردبووەوە، هەتا فاتیمە هات و پیسیەکەی لەسەر پشتی پێغەمبەر (ﷺ) لابردو قسەی بە قووڕەیشیەکان دەوت سەرباری ئەوەی کە فاتیمە لەو کاتەدا تەمەنی زۆر بچووك بوو!

سەبارەت بە بەرگری هاوەڵان لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکاتی جەنگەنکاندا، شەڕی ئوحود باشترین نموونەیە لە بەرگری کردن و پاراستنی پێغەمبەر(ﷺ) لەلایەن هاوەڵانەوە، بەردەوام قوڕەیشیەکان بەدووی پێغەمبەردا دەگەڕان هەتا شەهیدی بکەن! تامەزرۆیی هاوەڵانیش بۆ پاراستنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بێ وێنە بوو، کە چەندین هاوەڵ بوونە قەڵغانی پاراستنی پێغەمبەر (ﷺ) هەتا شەهید بوون و چەندانی تریشیان لەو پێناوەدا بریندار بوون، بەڵێ لەکاتێکدا دوژمنان بە ئاواتی شەهید کردنی پێغەمبەر بوون ،عوتبەی کوڕی ئەبی وەققاص بەردێکی گرتە پێغەمبەر(ﷺ) و بەر ددانی پیرۆزی کەوت و خڕێنەکەی خوارەوەی شکاند، ئەسپ سوارێکی بێ باوەڕانیش بەناوی (عبداللەی کوڕی قمئە) لەدوورەوە هات و شمشێرێکی لە شانی پیرۆزی پێغەمبەردا (ﷺ)،لە فەرموودەکاندا ئاماژە بەوە دراوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە

ڕۆژی ئوحوددا،ددانە چوارینەکەیان شکاندو سەریشیان بریندار کرد، لەم ساتە دژوارو ترسناکەدا هەردوو تەلحەی کوڕی عبیداللە و سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص گەورەترین سەروەرییان بۆ خۆیان تۆمار کردو بەردەوام بەرگریان لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکردو لێی جیا نەدەبوونەوە، ئا لەم ساتە ناسکەدا دەنگۆی شەهید بوونی پێغەمبەر (ﷺ) بڵاو بوویەوە، ئەنەسی کوڕی نەزر بەلای کۆمەڵێك موسڵماندا تێپەڕی کە شمشێرەکانیان بەدەستەوە بوو فەرمووی: ئەوە چاوەڕێی چی دەکەن.؟ لە وەڵامدا وتیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) شەهید بووە، فەرمووی: ئەدی لەدوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ژیانتان بۆ چییە.؟ هەستن و خێرا کەن بمرن لەپێناو ئەوەدا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پێناویدا مرد.!

## چوارەم: کۆچی دوایی پێغەمبەر( ﷺ ) و کاریگەری لەسەر هاوەڵان:

کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەورەترین کارەسات بوو کە بەسەر هاوەڵان دا هاتبێت،ماڵئاوایی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دونیای لەلای هاوەڵان تەواو تاریك کرد! بە جۆرێك کە فراوانی زەوی لە هاوەڵان هاتەوە یەك و بەرگی خەم و ماتەم ئاسمانی مەدینەی پۆشی، ئەنەسی کوڕی مالیك باسی ئەو ڕۆژە خۆشانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی پیرۆزی هاتە مەدینەو بوویە هۆی ڕووناك بوونەوەی مەدینەو، خەندەو بزەو خۆشی خستە هەموو ماڵێك ! پاشان باسی ڕۆژی وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکات، کە چۆن خەم و ماتەم و گریان و فرمێسك بۆ کۆچی پێغەمبەر (ﷺ) باڵی بەسەر مەدینەدا کێشابوو، هەمان کات زۆربەی هاوەڵان لەبەر زۆر خۆش ویستنی پێغەمبەر (ﷺ) نەیان دەویست بڕوا بەو کارەساتە خەمبارە بهێنن.

ئیمامی عومەر کە هەواڵی لە دونیا دەرچونی پێغەمبەری (ﷺ) پێ درا، دەست بەجێ تووڕە بوو و هۆشی لەلای خۆی نەماو شمشێرەکەی بەدەستەوە گرتوو

دەیفەرموو: هەر کەسێك بڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کردووە بەم شمشێرە لە گەردنی دەدەم، ئیدی ئیمامی ئەبووبەکر تەشریفی هێناو پاشان بۆ عومەری سەلماند کە پێغەمبەریش (ﷺ) دەبێت بمرێت: (انك ميت وانهم ميتون)... !

بەڵێ هاوەڵان حەقیان بوو ئەوەندە ناڕەحەت و خەمبار بن بە کۆچی دوایی پێغەمبەرەکەیان (ﷺ) ؟ چونکە ئەو بوو کە هاوەڵانی لە تاریکی کوفرو نەزانی ڕزگار کردن و بەرەو ڕووناکایی ئیسلام دەستی گرتن، پێغەمبەر بوو (ﷺ) ئەوانی فێر کرد کە دەبێت مرۆڤەکان وەك مرۆڤ بژین و سنوورەکانی مرۆڤ بوون نەبەزێنن، هاوەڵان چاك لەو ڕاستیە تێ گەیشتبوون کە وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) واتە پچڕانی پەیوەندی نێوان ئاسمانەکان و زەوی، هەروەك ئەمە وەڵامی ئوم ئەیمەن بوو بۆ ئیمامی ئەبووبەکرو ئیمامی عومەر(خوایان لێ ڕازی بێت) کاتێك لەپاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، سەردانی ئوم ئەیمەنیان کرد، ئوم ئەیمەن دەستی کرد بە گریان فەرموویان بۆچی دەگریت.؟!

ئەوەی لەلای خواوە بێت باشترە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: بۆ ئەوە ناگریم، دەزانم ئەوەی لەلای خوای گەورەیە بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) باشترە ! من دەگریم بۆ پچڕانی وەحی نێوان ئاسمانەکان و زەوی. ! ئیدی ئەوەندەی تر گریانەکەی درێژەی کێشاو، ئەوانیش لە گەڵیدا دەستیان کرد بە گریان!؟

# پێگەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەلای ئوممەتەكەی

## پێگەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەلای ئوممەتەكەی:

دڵی ئەم ئوممەتە پڕیەتی لەخۆشەویستی و سۆز بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەمە لە كاتێكدایە كە بە خزمەتی نەگەیشتوون و نەیان بینیوە، بەڵام لەگەڵ باس كردنی هەر بوارێكی تایبەت بەو سەروەرە (ﷺ) ئوممەتەكەی بەردەوام سەڵاوات و ڕەحمەتی بۆ دەنێرن، لەم تەوەرەدا بەكورتی ئاماژە دەكەین بەپێگەی پێغەمبەر(ﷺ) لەلای ئوممەتەكەی:

## یەكەم: هیوا خوازی و ئارەزوو مەندی بۆ دیتنی پێغەمبەر (ﷺ) لەلایەن ئوممەتەكەیەوە:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە چەندین فەرموودەدا ئاماژەی بە ئاستی خۆش ویستنی خۆی كردووە لەلایەن ئوممەتەكەیەوە،ئەوانەی كە لە پاش هاوەڵان دێن تا ڕۆژی دوایی!

ئەمە لەكاتێكدایە پێغەمبەریان (ﷺ) نەبینیوە بەڵام باوەڕیان پێی هێناوەو خۆشیان دەوێت، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژە بەوە دەكات كە لەناو ئوممەتەكەیدا كەسی ئەوتۆ هەیە، ئامادەیە هەموو ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامانەكەی ببەخشێت تەنها لەپێناو بینینی ڕووی جوان و درەوشاوەی پێغەمبەردا (ﷺ) !!

هەمان كات پێغەمبەریش (ﷺ) ئاواتی بەوە خواستووە كە بە براكانی بگات، لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: خۆزگە چاوم بە براكانم بكەوتایە، هاوەڵان بەپێغەمبەری خوایان (ﷺ) وت: ئەی ئێمە برای تۆ نین.؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئێوە هاوەڵی منن، براكانم ئەوانەن كە باوەڕیان بەمن هێناوە لەكاتێكدا منیان نەبینیوە.!

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) لە چەندین فەرموودەدا سەرسوڕمانی خۆی نیشانداوە بەرامبەر باوەڕ هێنانی ئەو کەسانەی کە نەیان بینیوەو بە تامەزرۆییەوە شوێنی دەکەون.

## دووەم: پێداگری فەرموودە ناسەکان بۆ بیستنی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ):

پێداگری فەرموودە ناسەکان و سوور بوونیان لە سەر بیستنی فەرموودەکانی پێغەمبەرو بڵاوکردنەوەیان و گەیاندنیان بە نەوەکانی پاش خۆیان،باشترین بەڵگەیە لە سەر گەورەیی پێگەی پێغەمبەر (ﷺ) لەلای ئوممەتەکەی، وەك چۆن پێداگر بوون لە سەر بیستنی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، هەمان کات هیچ ناڕەحەتییەك نەیتوانیوە لەم ئاواتە ساردیان بکاتەوە، ڕێ کردنی چەندین مانگ بەپێ لەپێناو فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) لەلایان زۆر ئاسان بووە، ئاشکرایە هەموو هەوڵ و ماندوو بوونێکیان تەنها لەبەر خۆشەویستی پێغەمبەرەکەیان بووە (ﷺ) کە لە خوارەوە بەکورتی ئاماژە بە پەرۆشی فەرموودە ناسان دەکەین بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

### فرۆشتنی ماڵ و موڵکیان:

(سفیان)ـی کوڕی (عیینە) دەفەرمووێت: گوێم لە شوعبە بوو کە دەیفەرموو: هەر کەسێك داوای زانستی فەرموودە (حدیث) بکات و بە شوێنی بڕوات ئەوا لەڕووی مادییەوە مایە پووچ دەبێت و پارەی بەدەستەوە نامێنێت،بەوهۆیەوە لەگان (تەشت)ـەکەی دایکمم بە حەوت دینار فرۆشت.

### زۆر بەرگە گرتنیان بۆ برسییەتی:

(عبدالرحمن) ی کوڕی ئەبی حاتەم دەفەرمووێت: ئێمە حەوت مانگ لە میسر بووین لەو ماوە یەدا هیچ خواردنێکی شلەمان نەخوارد، لە هەموو ڕۆژەکانماندا لای مامۆستاکانمان سەرگەرمی خوێندن بوین ، شەوانیش سەرگەرمی چاوپێکەوتن و وتوو

وێژ بووین سەبارەت بە وانەکانمان، بواری ئەوەمان نەبوو کە خواردن بۆ خۆمان ئامادە بکەین!

ڕۆژێك خۆم و هاوەڵەکەم لە بازاڕدا (ماسی) مان بەر چاو کەوت و دووچاری سەر سوڕمان بووین! پاشان ماسیە کمان کڕی، بەڵام کاتی وانە خوێندن گەیشتینەوە ماڵەوە، ئیدی نەمان توانی چاکی بکەین و چووینەوە خزمەتی مامۆستاکانمان و،سەرئەنجام پاش سێ ڕۆژ بواری گەڕانەوەمان بۆ ڕەخسا بۆ ماڵەوە، خەریك بوو ماسییەکە بۆنی دەکرد ، ئیدی بەکاڵی خواردمان!

چونکە بواری ئەوەمان نەبوو بیدەینە کەسێك تا بۆمان چاك بکات، پاشان (عبدالرحمن) فەرمووی: بە ئارامی جەستەت ناتوانیت زانست وە دەست بخەیت.؟!

## ئەنجام دانی گەشتی دوورو درێژو پڕووکێنەر:

ئیبن ئەبی حاتەم دەفەرمووێت: گوێم لەباوکم بوو دەیفەرموو: یەکەم ساڵ کە بۆ دەست خستنی زانستی فەرموودە ڕۆیشتم ماوەی حەوت ساڵم پێ چوو، ئەوەندەی لە یادم بێت ژمارەی (فرسەخ)ی[1] پیادە ڕۆییم زیاترە لە هەزار فرسەخ کە ژماردوومە، ئیدی کە لە هەزار فرسەخ تێ پەڕی کرد وازم لە ژماردنی هێنا، نازانم چەند جار بەپیادە لە کوفەوە سەردانی بەغدام کردووە، وە لە مەککەوە بۆ مەدینە زۆر جار بە پێ ڕۆیشتووم، لە بەحرێنەوەو لە نزیك شاری (سەلا) وە بە پێ ڕۆیشتووم بۆ میسر، هەروەها لە میسرەوە بۆ ڕەملە،وە لە ڕەملەوە بۆ (بيت المقدس) بە پێ ڕۆیشتووم، لە ڕەملەوە بۆ عەسقەلان و،لە ڕەملەوە بۆ تەبەریەو، لە تەبەریەوە بۆ دیمەشق و، لە دیمەشقەوە بۆ (حیمص) و، لە (حیمص) ەوە بۆ ئەنتاکیەو لەوێشەوە بۆ تەرسوس،پاشان لە تەرسوسەوە گەڕاومەتەوە بۆ (حیمص) لەپێناو بیستنی بەشێك لەو فەرموودەیەی کە لەلای ئەبی یەمان بوو، پاشان لە (حیمص) ەوە ڕۆیشتووم بۆ

---

[1] فرسەخێك نزیکەی(٥-٦)کیلۆمەتر دەبێت

بەیسان و لە بەیسانەوە بۆ (الرقە)، پاش ئەو هەموو پیادە ڕۆییە ئینجا لە (الرقـە) دا سواری کەشتی بووم بەرەو بەغدا، لەپێش ڕۆیشتنم بۆ شام لە (واسـط) ەوە چـووم بـۆ نیل و، لە نیلەوە بۆ کوفە ئەم شوێنانەم هەموو بەپێ بڕیوە..!!

هـەروەها وتـراوە بـە بـەردەوامی لـە شـەو و ڕۆژێکدا مـاوەی بیـست فرسـەخ بـەپێ ڕۆیشتووە، هەمان کات لە توانایدا هەبووە کە ئەو هەموو ڕێگەیە ببڕێت.

## سێیەم: زۆر گرنگی دانیـان بـە شـارەزا بـوون لـە هـەموو بوارەکـانی ژیـانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ورد بوونەوەو ڕامان لەشێوازی هەڵس و کەوت کردنی:

بەدرێـژایی مێـژوو هـیچ سـەرکردەیەك نـەبووە هاوەڵـانی ، بـە ئەنـدازەی هاوەڵـانی پێغەمبەر (ﷺ) خوازیاری شارەزا بوون بووبن لـە هـەموو بوارەکانی ژیـانی و، شـوێن کـەوتنی شـوێنەوارەکەیی و گواسـتنەوەی هەواڵـە دوورو نزیکـەکان لێیـەوە، ئەمـەش هۆکری ئوممەتەکەی بۆ ئەو دەردەخات، کە لە ئەندازە بەدەر پێغەمبەرەکـەیان (ﷺ) خۆش ویستووەو بە گەورەیان زانیوە، زانایان لە هەموو ئەو بوارانەدا کاریـان کـردووەو پارێزگاریان لە کاروباری ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) کردووە بە هەموو بوارەکانـەوە، هـیچ شـێتك لـەژیانی پێغەمبـەر (ﷺ) نیـە کـە باسـیان نـەکردبێت، لـە فەرمانـەکانی یـان لەڕێگری و ئاگادار کردنەوەکانی هەموویان بۆ باس کـردووین، تـەنانـەت باسـی شـێوازی هەستان و دانیـشتن و پێکـەنین و زەردەخەنـەو عیبـادەتی شـەو و ڕۆژی پێغەمبـەریان (ﷺ) بۆ ئێمە گێڕاوەتەوە، بگرە باسی چۆنیەتی خواردن و خواردنەوەو پۆشاك لەبـەر کردنی پێغەمبەریان (ﷺ) بۆ ئێمە گواستووەتەوە، هەروەها شـێوازی هـەڵس و کـەوت کردنی لەگەڵ خەڵکی و خێزانەکانیشی بۆ ئێمە باس کراوە.

وە چەندین فەرموودە هەن کە باس لە شێوەی جەستەی پێغەمبـەر (ﷺ) دەکـەن لە درێـژی جەسـتەیی و ڕەنگـی قـژو ڕیـشی پـیرۆزی، شێوەی پۆشـاکی، حـەزی لـە چ ڕەنگێك بووە، چ بۆنێکی لەلاخۆش بووە، خواردن و خواردنەوەی چی بووە...هتد.

بـەکورتی هـیچ بـوارێکی ژیـانی پێغەمبـەر (ﷺ) نـەماوە کـە لـەلای ئێمـە شـاراوەو نەزانراو بێت.

# پێگەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەلای بونەوەرانی دی

## پێگەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لای بونەوەرانی دی

وەنەبێت پێغەمبەری ئازیزمان تەنها لەلای هاوەڵان و نزیکان و باوەڕداران بەرز و بەڕێز بووبێت، بەڵکو لە لای گیانداران و تەنانەت دارو بەرد و درەختی بێگیانیش جێگەو پێگەیەکی بەرزی هەبووە.

هەر ئەو کاتەی کە ئازیزمان لەتەمەنی منداڵیدا بوو کە دوانزەساڵ و نزیکەی دوومانگ وده ڕۆژ دەبوو، جارێکیان لە گەڵ ئەبو تالیبی مامی دا کە بۆ بازرگانی بەرەو شام دەچوون، کاتێك گەیشتنە بوسرا کەئەوێ ناوچەیەکە سەر بەشامەو بەشێکە لەحوران،لەو کاتەدا بەشێك بوو لەو ناوچەی عەرەبیەی کەوتبوە ژێر دەسەڵاتی ڕۆمانەکانەوە، لەو شوێنەدا ڕاهیبێك هەبوو بە (بوحەیرا) ناوی دەرکردبوو، کە خۆی ناوی (جەرجیس) بوو، کە کاروانەکە گەیشت ،بوحەیرا چووە دەرەوە بۆلایان، ڕێزی لێنان و باشترین خواردنی بۆ ئامادە کردن..!بێ گومان ڕێزو حورمەتی (بوحەیرا) بۆ ئەم کاروانە بازرگانیە تەنها لەبەرخاتری پێغەمبەری خوا بوو! (بوحەیرا) پێغەمبەری ئازیزمانی بە سیفەتە کانیدا ناسیەوە، دەستی گرت و بە ئەبو تالیبی ووت: ئەمە سەردارو سەرووەری جیهانیانە، خوای گەورە ئەم مرۆڤە بەڕەحمەت بۆ گشت جیهانیان دەنێرێت! چاك ئاگادارو پارێزەری بن و خێرا لەشام کارەکانتان جێ بە جێ بکەن و بەرەو وولاتی خۆتان بگەڕێنەوە؟چونکە ئەگەر جولەکەکان بیبینن ئەوا دەستبەجێ دەیناسنەوەو لە ڕژدی خۆیاندا دەیکوژن!

لەو کاتەداچەند ڕیش سپییەکی قورەیش ووتیان تۆ چۆن ئەمە دەزانیت؟

(بوحەیرا) لە وەڵام دا ووتی: کاتێك ئێوە لە عەقەبەوە هاتن، دارو بەرد نەما کڕنووشی بۆ نەبات، ئەوانە ( دارو بەردی بێ گیان) ن جگەلە پێغەمبەر کڕنووش بۆ

هـیچ کەسـێکی تـر نابـەن، هـەروەها مـن بـەهۆی مـۆری پێغەمبەرایەتیەکەیـەوە دەیناسمەوە.؟!

وە لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە کاروانە بازرگانیەکـەی قـوڕەیش سـەر سوڕمانی خۆیان لەو پێشوازیە گەرمەی (بوحەیرا) دەردەبڕن و پێی دەڵێن کەچەندین جار ئێمـە بەم ناوچەدا هاتوین و گوزەرمان کردووە، بـەڵام تـۆ گوێت پـێ نـەداوین هۆکـاری ئـەم پێشوازیە گەرمەی ئێستات چیە؟(بوحەیرا) ش لەوەڵام دا دەڵێت:پـێش ئـەوەی بگەنـە ئێرە من پەڵە هەورێکم دی کە بەرەو ئێرە دەهات؟بۆم دەرکەوت کە ئـەو پەڵـە هـەورە سێبەری بۆ پێغەمبەری ئاخیر زەمان کردووەو زانیم بەرەو ئێرە دێت،لەبەر ئەوە حـەزم کرد لەبەر خاتری ئەو پێغەمبەرە ئازیزە دەعوەتتان بکەم و لەبەر ئـەوە پـێش ئـەوەی بگەن بڕیارمدا چاکترین خواردنتان بۆ ئامادە بکەم.

هـەمان کـات دارو بـەردیش خۆشەویستی خۆیـان بـۆ پێغەمبـەری خـوا دەربڕیـوە کاتێك بەڕێگادا دەڕۆیشت، بـەرد وشاخ سـەلامیان لێ دەکرد،ئەمـەش بـۆ ئـەوەی هـەتا پێغەمبەر لە پلە وپایەی خۆی تێ بگات و، بزانێت کە لەم بوونەوەرەدا هەموو دروسـت کراوەکان بەندەی خوای گەورەن و تەسبیحاتی ئەو زاتە پاك وبەرزو بڵندە دەکەن...

هەروەها پێغەمبەری نازدارمان نووری چاوو وزەی بەردەوامان دەفەرموێت:

(اني لاعرف حجرا بمكة كان يسلم علي قبل ان ابعث، اني لاعرفه الان) .

واتە: لەمەککەدا بەردێك دەناسم، بەر لـەوەی لەلایـەن پەروەردگارمـەوە وەحـیم بـۆ بێت و، ببمە پێغەمبەر، ئەو بەردە بەردەوام سلاوی لێ دەکردم، ئێـستاش ئـەو بـەردە دەناسمەوە.

هەروەها یەعلای کوڕی سـەییابە دەگێڕێتـەوە کـە جارێکیـان درەختـی (تـەلح) یـان درەختی (سەمورە) بوو،هات و جارێك بەدەوری پێغەمبەردا گەڕاو پاشان ڕۆیشتەوە بۆ شوێنەکەی خـۆی! پاشـان پێغەمبـەر فـەرمووی ئـەم درەختـە مۆڵـەتی لێ وەرگـرتم تـا سەلامم لێ بکات!؟

لە فەرمودەیەکی دیکەدا ئیمامی (تیرمزی) لە ئیبن عەبباسەوە گێڕاویەتیەوە، هاتووەو دەفەرموێت :پێغەمبەری خوا بەپیاوێکی دەشتەکی فەرموو: ئەگەر بەو هێشووە خورمایە بڵێم وەرە،ئەویش بێت!ئایا شاهێدی ئەوە دەدەیت کە من پێغەمبەری خوام؟ئەویش ووتی: بەڵێ ،پێغەمبەر هێشوە خورماکەی بانگ کرد،هێشوەکەش بە تەکاندان هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا!پاشان پێغەمبەر فەرمانی پێدا بگەڕێتەوە شوێنی خۆی، ئەویش دەستبەجێ گەڕایەوە شوێنەکەی!؟

هەروەها ئیمام عەلی(خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: جارێکیان لە مەککە لە خزمەتی پێغەمبەردا دەر چووین بۆ شوێنێك، لە ڕێگادا تووشی هەر شاخ و دار و درەختێك دەبووین، بەزمانێکی ڕەوان و پاك دەی ووت: سڵاوت لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا.

پێویستە ئاماژە بەوەش بدەین کەلەسەردەمی بانگەوازی مەککیدا زۆر جار خۆشەویستمان لە هەڵسوکەوتی نەشیاوی هاوبەش پەیدا کەران بەرامبەر بەخۆیی و هاوەڵە بەڕێزەکانی و بانگەوازەکەی ناڕەحەت وخەمبارو بێ تاقەت دەبوو ، لەوبارەوە لە ڕیوایەتێکی ئەنەسدا هاتووە: کە ڕۆژێك حەزرەتی جبریل پێغەمبەری خوای بەخەمباری بینی،فەرمووی حەز دەکەیت نیشانەیەکت نیشان بدەم ؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی بەڵێ، پاشان جبریل درەختێکی پیشانی پێغەمبەری خوادا کەلەپشتی شیوەکەوە بوو،حەزرەتی جبریل فەرمووی :ئەی پێغەمبەری خوا ئەو درەختە بانگ بکە! کە بانگی کرد دەستبەجێ درەختەکە بە ڕەگ و ڕیشەیەوە هەڵکەنراو کەوتە ڕێ و هاتە بەردەمی پێغەمبەری خوا ! پاشان جبریل فەرمووی فەرمان بدە بابچێتەوە شوێنی خۆی،کە پێغەمبەر فەرمانی گەڕانەوەی پێدا ئیدی درەختەکە گەڕایەوە شوێنی خۆی؟!

هەروەها جابیری کوڕی عەبدوڵلا دەفەرموێت: لە گەڵ پێغەمبەری نازدارماندا لە سەفەرێك دەگەڕاینەوە، چووینە باخ و بێستانێکی بەنی نەجارەوە، ئەو باخە

وشترێکی تیابوو بەلەسە ببوو و، گرتن وبەستنەوەی لەتوانای هیچ کەسدا نەبوو، هەرچی بڕۆشتایە بەلایدا پەلاماری دەدا و هێرشی دەکردە سەر، ئەمەیان بەپێغەمبەری ئازیزمان ڕاگەیاند و داوای چارەسەرێکیان لێکرد، ئەویش چووە ناو باخە کەوە و بەرەو وشترەکە چوو وبانگی وشترەکەی کرد،دەستبەجێ وشترەکە هاتە بەردەمی پێغەمبەری خواو بەچۆکدا هات و ملی کەچ کرد.... ئینجا پێغەمبەری نازدارمان داوای کرد و فەرمووی لغاوەکەیم بۆ بهێنن، بەو جۆرە لغاوەکەی کردەوە ملی و دایەوە دەست خاوەنەکەی و فەرمووی: (انه ليس شيء بين السماء والارض الا يعلم اني رسول الله، الا عاصي الجن والانس) .

واتە: بەڕاستی هیچ شتێك لەنێوان ئاسمانەکان و زەویدا نیە، مەگەر دەزانێت کە من پێغەمبەرو نێردراوی خوای گەورەم، تەنها سەرپێچی کەران ویاخیبوانی جنۆکەو مرۆڤ نەبێت.

وەلە بارەی خۆشەویستی شاخی ئوحودەوە سەردارو ئازیزمان دەفەرمووێت: (ان أحدا يحبنا ويحبه) .

واتە: بەڕاستی ئوحود شاخێکە ئێمەی خۆشدەوێت و ئێمەش ئەومان خۆشدەوێت .

هەر سەبارەت بەپێگەی پێغەمبەری نازدارمان لەجیهانی دارو درەختدا حەز دەکەین کە ئاماژە بە موعجیزە سەرسوڕهێنەرە مەشهورەکە بدەین،کە ئەویش بێ تاقەتی و گریانی بنەدارەکە بوو بۆ دووری لەپێغەمبەری خوا! (کەئەمەش فەرمودەیەکە پلەی موتەواتیری وەرگرتووەو،ئیمامی بوخاری و موسلیم و جگە لەمانیش ئەم فەرمودەیان ڕیوایەت کردووە) لەم بارەوە جابیر دەفەرمووێت: کاتێك پێغەمبەر ووتاری بخوێندایەتەوە، پاڵی دەدا بەیەکێك لەو بنەدارانەوە کە بنمیچی مزگەوتەکەیان لەسەر دانرابوو، هاوەڵان دوانگەیەکیان بۆپێغەمبەر دروست کرد،کاتێك پێغەمبەر بۆ وتار دان ڕۆیشتە سەری، دەنگێکی وەك دەنگی وشتری ئاوسمان لەو بنەدارە بیست، بنەدارەکە بێ دەنگ نەبوو، هەتا پێغەمبەر هات و دەستی بەسەردا هێنا ئینجا بێ دەنگ بوو!

ئەنەس دەفەرمووێت:دەنگەکە بەڕادەیەکی ئەتۆ بوو کە مزگەوتەکە لەبەر ناڵە ناڵی ئەو بنەدارە کەوتە لەرینەوە.

سەهلی کوڕی سەعدیش لەڕیوایەتێکدا دەفەرمووێت:خەڵکەکەش بەگریان و بێ تاقەتی ئەم بنەدارە کەوتنە گریان!

هەروەها لەفەرمودەکەی بورەیدەشدا هاتووەو دەفەرمووێت: کاتێ بنەدارەکە گریا ،پێغەمبەر دەستی پیرۆزی لەسەر داناو پێی فەرموو: ئەگەر بتەوێ داوا لە خوای گەورە دەکەم،هەتا بتکاتەوە بەدارێکی سەوزو بەرهەم داری دونیا؟ئەگەریش حەز بکەیت ئەوا داوا لەخوای گەورە دەکەم کە بتکاتە درەختێکی سەوزو بەرهەم داری بەهەشت،بەشێوازێك کە ئەولیاکانی خوا لە بەرهەمت بخۆن؟ پاشان پێغەمبەر گوێی بۆ ڕاگرت تا بزانێت چی دەڵێت، ئەویش لە وەڵام دا وتی:حەز دەکەم ببمە درەختێکی سەوزو بەرهەمداری بەهەشت و ئەولیاکانی خوا لە بەرهەمەکەم بخۆن...؟!

ئەی هاوار بۆ ئێمەی لاری زۆر بڵێی کەم کار و کردار، بنکە دارخورمایەکی ووشکی ڕەقی تەقی بێ جووڵەو بێ گیان هاواری بۆ ئەو سەروەرە ئازیزەمان بەرز بوویەوە و بەدوورییەکی کەمی ئەو ڕازی نەبوو، دەبێت تامەزرۆ بوونی ئێمە کامەبێت و چەند جار گریابین بۆ ئەو دوورییە زۆرەمان لەسەروەری ئازیزمان؟؟؟! ئایا ئەمە وانەیەك نیە بۆ خۆشەویستی،کە خوای گەورە ویستوویەتی فێری هاوەڵان وشوێنکەوتوانی ئەو ئازیزو خۆشەویستەی بکات؟

ئایا ئەمە پەند و عیبرەت نیە بۆ ئەوەی موسڵمانان لە هەموو کات و سەردەم و جێگەو شوێنێکی گونجاودا،لە یادی ئەو ئازیزەیاندا بن و بە خۆشەویستیەکەیاندا بچنەوە.

با ئێمەش ساتێك بێخود ئاسا بڵێین:

بە تیکە تیکەبێ دڵێك کە نەیبێ ئیشتیاقی تۆ

حەیاتی من ویساڵی تۆ مەماتی من فیراقی تۆ

شێخ حەسەنی بەسرِی فەرموویەتی: موسوڵمانینە! بنکە دار خورمایەك دەناڵێنیّ بۆ پێغەمبەری نازدارمان و، شەوق وتامەزرۆیی بۆ دیداری فەخری کائینات هەیە، داخۆ ئێوە لەپێشتر نین کە شەوقتان بۆ دیداری ئەو خۆشەویستە لە هەموو شت زیاتر بێت؟

ئیمام شافیعی دەفەرمووێت: خوای گەورە بنکە دارێکی والیّ کرد کە بۆ پێغەمبەری نازدارمان بناڵێنێت، کە ئەمەش بە ڕاستی لە مردوو زیندوو کردنەوەکەی حەزرەتی عیسا زۆر گەورەترە...

# بەشی دووەم

# ڕۆژئاواییەکان چییان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەوێت

لەم تەوەرانە پێك دێت:

* هۆکارەکانی سوکایەتی کردن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)
* ئەو سوکایەتیانەی لەم سەردەمەدا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکرێن
* قسە وتن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنێوان شەریعەت و بانگەشەی ئازادی بیروڕادا
* سەرخستنی پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ)
* هەمووان پێکەوە بەرەو بەرنامەیەکی شەرعی بەردەوام بۆ بەرگری کردن لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)
* پەیامی کۆتایی کۆنگرەی (رحمة للعالمين)

## هۆکارەکانی سوکایەتی کردن بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)

لەم چەند ساڵەی دواییەدا بەپیلانێکی نەخشە بۆ کێشراو لەلایەن هەندێك لە پێشەوای ئاینی (گاور و جوولەکە) و سیاسەت مەدارو ڕۆژنامەنووسانەوە زۆر بێ شەرمانە هێرش دەکرێتە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)،بێ گومان ئەم دەست درێژی و بێ ڕێزییانە بەرامبەر سەرجەم پێغەمبەران و پێغەمبەری خۆشمان(ﷺ) شتێکی نوێ نیەو مێژووەکەیان بۆ سەر دەمانێکی کۆن دەگەڕێنەوە، بەدڵنیاییەوە خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی ناردبێت لەلایەن گەلەکەیەوە بێ ڕێزی پێ کراوە ﴿وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿١٠﴾﴾ الانعام: ١٠.
﴿يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٣٠﴾﴾ يس: ٣٠.

وە چەندین ئایەتی تر ئاماژە بەوە دەکەن کە پێغەمبەران لەلایەن دوژمنانەوە ئیهانەو سوکایەتییان پێ کراوە.

کەواتە بۆمان دەرکەوت کە دژایەتی پێغەمبەران شتێکی نوێ نیە،بەڵام ئەوەی کە ئێستا سەری هەڵداوە دەست درێژی کردنە بۆ سەر کەسایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)! بۆ ئەمەش پاساو و دەستەواژەیەکی بێ بنەمایان داڕشتووەو بەناوی جیهانگیریی و ئازادی بیروباوەڕەوە بەئاشکرا هێرش دەکەنە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بەتایبەت لەپاش یانزەی سێپتەمبەرەوە بەپیلانی نەخشە بۆ کێشراو و بێ شەرمانە هێرش دەکەنە سەر ئەو پێغەمبەرە ئازیزە (ﷺ).

لەئێستادا بەرنامەی نوێی دوژمنانی ئیسلام بۆ سوکایەتی کردن بەپێغەمبەر (ﷺ)، خۆی دەبینێتەوە لەکاری تاکە کەسی یان هەوڵی چەند باڵێکی ناو ئاینەکان، وە هەندێك جار ئەم کارە لەلایەن سەرکردە سیاسیەکانەوە پێشڕەوایەتی دەکرێت، هەروەها ئەحبارو ڕوهبان و دامەزراوەو کۆمپانیاکانی ڕاگەیاندن زۆر بە دڵنیاییەوە پێشڕەوایەتی ئەم کارە دەکەن و، بەدواداچوون دەکەن بۆ جێ بەجێ کردنی

نەخشەکانیان لەدژی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، هەروەك لەکاتی کۆنگرە ڕۆژنامەنووسیەکاندا ڕاگەیاندکارو کەسە دیارەکانی ڕۆژئاوا، لەو بارەوە بێ شەرمانە لێدوان و ڕوون کردنەوە دەدەن.

ئەمە لەکاتێکدایە ڕۆژئاوا بانگەشە دەکات بۆ پێکەوە ژیانی ئاشتیانەو ڕێزگرتن لە پیرۆزی ئاینە کان و دروشمی دژایەتی کردنی دەمارگیری بەرز کردوەتەوە ! بێ گومان هەموو ئەم درووشمانە تەنها لافیتەی سەر دیوارن و جگە لە چەواشەکاری هیچی دیکە نین، پێویستە ئاماژە بەوەش بدەین کە بێ ئەدەبی و گاڵتەکردن تەنها بەرامبەر بەپێغەمبەری خۆمان (ﷺ) ناکرێت، بەڵکو کار گەیشتووەتە ئەوەی گاڵتە بە هەموو ئاین و یاسا ئاسمانیەکان دەکرێت، بێ گومان هیچ جیاوازییەك نییە لەنێوان پێغەمبەران و ئەو پەیامەی لەلای خواوە بۆیان هاتووە، سوکایەتی بە پەیامێکی ئاسمانی سوکایەتی کردنە بەپێغەمبەرەکەو بەپێچەوانەشەوە، هەروەها سەبارەت بەپێغەمبەری خۆمان(ﷺ) کە قورئانی بۆ دابەزێنراوە ،سوکایەتی کردن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوکایەتی کردنە بە قورئان و بەپێچەوانەشەوە ڕاستە.

ئەوەی مایەی نیگەرانییە هیچ کات دەوڵەتانی ڕۆژئاوا ئامادە نەبوون ئیدانەی ئەم دەست درێژیانە بکەن و لەئاستی ئەم دیاردانە کەم بکەنەوە،بەتایبەت پاش ئەوەی دەرکەوت کە دەوڵەتانی ئەورووپا لەپشت ئەم نەخشە دۆزەخیانەوەن لە دژی ئیسلام و پێغەمبەرە ئازیزەکەی (ﷺ) ، لە ڕوانگەی ئەو ڕووداوانەوە کە لە ڕابردوودا ڕوویانداوە، پێویستە باسێك لەم دیاردەیە بکەین و توێژینەوەی لەسەر بکەین، هەتا بەشێوازێکی زانستیانە هۆکارەکان دیاری بکەین و چارەسەری بەسوودیان بۆ دابنێین.

لێرەوە تێگەیشتین لەدۆخی ئێستامان ، کە پێویستە لەئاست ئەم دیاردەیەدا بووەستین و چارەسەری بۆ بدۆزینەوە،بەداخەوە دەڵێم بە هۆی ئەم دیاردەیەوە ڕۆژانە پیرۆزیەکانمان دەکرێنە ئامانج و ئایینەکەمان بە (پێغەمبەرو بەرنامە) کەیەوە لەخاچ دەدرێن.

**لەپێش باس کردنی هۆکارەکانی سوکایەتی کردن بە پێغەمبەر (ﷺ)، پێم خۆشە لە چەند خاڵێکدا ئاماژە بکەم بە هەڵوێستی کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی و بۆچوونیان سەبارەت بەئاینی ئیسلام:**

١- دەرکەوتنی گرووپە چەپە توندڕەوەکان لەم چەند ساڵەی دواییەدا لە( ئەمریکادا بێت یان لە ئەوروپا) دا چوون یەکە، هەمان کات ڕەگەز پەرستەکانی ئاینی مەسیحی دەوری بالآیان هەیە لە ڕێرەوی سیاسەتی گشتی داو،دەتوانن ڕۆڵێکی کاراو ڕاستەوخۆیان هەبێت لەناوەندی بڕیاردانی وڵآتدا، ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ توانای باڵی (موحافزین) پارێزکارەکان لە بەڕێوە بردنی دەوڵەت لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، هەروەك زۆرێك لە دەنگ دەرانی ئەوروپا لە هەڵبژاردنەکان دا لە بەرژەوەندی گرووپە ئاینیەکانی کەنیسە دەنگ دەدەن، هەمان کات لە ئەمڕۆماندا مشتومڕێکی زۆر لە ئارادایە سەبارەت بە شووناسی مەسیحی بوونی ئەوروپا. ! ئایا دەستوور وەك خۆی بمێنێتەوە یان هەموار بکرێتەوە، ئەوروپا لەگەڵ دراوسێ تورکەکانی دا مامەڵە بکات یان بە پێچەوانەوە.

٢- هەروەها بۆچوون و ئاراستەیەکی عەلمانی دژە دینی لەکۆمەڵگە ئەوروپیەکاندا بەشێوەیەکی گشتی بوونی هەیە، ئەوانیش ئەوانەن کە بە هیچ جۆرێك بڕوایان بەئاین نییەو خۆیان بەئایندار نازانن ،تەنانەت ئەگەر ئاینەکە بت پەرستیش بێت یاخود ویژدانی دڵ بێت،جگە لەوەش هەندێکیان وەك نووسراوی سەر پێناسیش ڕێگە بە خۆیان نادەن هەڵگری هیچ جۆرە ئاینێك بن، ئەمانە هیچ شتێك بە پیرۆز نازانن، وە خۆیان ناپارێزن لەگاڵتە کردن بەپێغەمبەران و پەیامەکانیان، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی ڕۆشنبیرییان، کە بە شێوەیەکی هەڵە لە هەموو ئاینەکان تێ گەیشتون،هۆکاری ئەمەش ئەو شۆڕشەیە لە دژی کەنیسە بەرپاکرا، لای هەمووان ڕوونە بە ئاشکرا بوونی ستەمی کەنیسە ئیدی بەبێ زانیاری هەموو ئاینەکانیان لەلای خۆیان وەك ئاینی مەسیحی پێناسە کردووە.

٣- ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرپەرشتی هێرشێکی ناڕەوا دەکات بۆ سەر ئیسلام و موسڵمانان ، بەتایبەت لەدوای ڕووداوەکانی یانزەی سێپتەمبەرەوە ،بەئاشکرا ئەمریکاو ڕۆژئاوا بوونە هاوپەیمان بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام، ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت ئەمریکا بەهیچ شێوازێك ناچێتە ژێر باری ئەوەی کە پێناسەیەك بۆ وشەی (الإرهاب) دابنرێت کە خۆی سەرپەرشتی دەکات، هەموو توانا سەربازی و ڕامیاری و ئابووری و ڕۆشنبیریەکانی خۆی تەرخان کردووە بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام و ئوممەتی ئیسلامی، ئیدی لە هەر شوێنێکی جیهاندا ڕقی لە هەر پارت و کۆمەڵێکی ئیسلامی بکەوێت، دەستبەجێ دەیخاتە خانەی تیرۆرەوەو بەو بیانووەوە لەناوی دەبات، تەنانەت لە جەنگی (دژە تیرۆر)ەکەی ئەمریکادا خەبات کارانی غەززەو شیشان بە تیرۆریست لە قەڵەم دەدرێن و، ڕووسیاو تورکیای عەلمانی و قەوارەی زایۆنیش بە ئازادی خوازو مرۆڤ دۆست دێنە ئەژمار! بەو شێوەیە ئەمریکا بەبیانووی جەنگی دژە تیرۆر دەستی خستووەتە گەرووی ئوممەتی ئیسلامیەوە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بارودۆخی موسڵمانان خراپتر دەبێت و کەسیش بوێ نیە لە بەرامبەر ئەم ستەمە یەك لەدوای یەکانەی ئەمریکادا بتوانێت قسە بکات. ! بەدڵنیاییەوە ئەمەش هەر درێژ کراوەی جەنگی خاچ پەرستییە لە دژی ئیسلام، بەڵام لەژێرناوێکی تردایە! ئامانجی سەرەکی ئەمریکاش لەم جەنگەدا دەست گرتنە بەسەر جیهاندا، وەك دەزانین گەورەترین دامەزراوەی ڕاگەیاندنیش لەم هێرشە ناڕەوایەدا پشتگیری ئەمریکا دەکات و، بەردەوام ئاینی ئیسلام بە تیرۆر و توندڕەوی تاوانبار دەکات! بەو بیانووەوە دژایەتی ئیسلام دەکات، ئەمە لەکاتێکدایە کە سەدەها گرووپی تیرۆریستی مەسیحی و جوولەکە لە ئەورووپاو ئەمریکاو جیهاندا بوونیان هەیەو کاری سەرەکی ئەم گرووپانە کوشتن و سەربڕین و فڕاندنی مرۆڤەکانە. ! بەڵام جەنگی دژە تیرۆر ئەمانی نەگرتوەتەوە. ! لەبەر ئەوەی لە سەنگەری ئەمریکادا کار دەکەن کوشتن و سەر بڕینەکەشیان بە خزمەتی مرۆڤایەتی دێتە ئەژمار!

٤- ئەمریکاو ئەوروپا لەئەمڕۆماندا ترسێکی گەورەیان هەیە سەبارەت بە دووبارە گەڕانەوەی شارستانیەتی ئیسلامی ! ترسیان هەیە کە ئیسلام ببێتەوە بە ڕکەبەرە بەهێزەکەی شارستانیەتی ڕۆژئاوا؟بەڵێ ئەمانەو چەندین هۆکاری تر وا دەکەن کە بەردەوام دوژمنان دژایەتی ئیسلام و موسڵمانان بکەن.

پێویستە لێرەدا ئاماژە بەوە بکەین کە ئێمەی موسڵمانان هەرگیز ئاینەکەمان ڕێگەی ئەوەمان پێ نادات لەم هێرشەی دوژمناندا، هەموو ڕۆژئاوا بکەینە هاوبەش و شەریکی ئەو هێرشانەی کە دەکرێنە سەر ئیسلام و موسڵمانان، بەڵکو ئەوروپاو ڕۆژئاوا چەندین بیروبۆچوونی جیاواز لەخۆ دەگرێت و هەر یەکەیان بۆچوونێکی هەیە سەبارەت بەئیسلام، دەتوانین هەڵوێستی کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان بەرامبەربە ئیسلام بەسەر پێنج گرووپدا دابەش بکەین، ئەوانیش:

١- کۆمەڵێکیان تەنها ئامانجیان دژایەتی کردنی ئیسلام و موسڵمانانە، بەردەوام کاریان گاڵتە کردنە بەئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، دەتوانین بڵێین ئەم گرووپەیان درێژە پێدەری هەڵوێستی باو باپیرانیانن لە بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام و ڕشتنی داخی دڵی خۆیان بەرامبەر ئەم ئاینە مەزنە.

٢- کۆمەڵی دووەمیان لە نەزان و سپڵەکان پێك هاتوون، ئەمانە هیچ شارەزاییەکیان سەبارەت بە ئیسلام نیە، بگرە ئەگەر زانیارییەکیان سەبارەت بە ئیسلام هەبێت ئەوا لە کۆمەڵی یەکەمەوە وەریان گرتووەو نەزانانە شوێن کۆمەڵی یەکەم کەوتوون، ئەمانیش سەبارەت بە ئیسلام وەك کۆمەڵی یەکەم ستەمکار و داپۆشەری حەق و ڕاستین.

٣- کۆمەڵی سێیەم دەکەوێتە نێوان کۆمەڵی یەکەم و دووەمەوە، دەتوانین بڵێین ئەمانە هیچ ئامانجێکیان نییە جگە لە تێرکردنی ئارەزوو و حەزە سێکسیەکانیان، نایانەوێت هیچ شتێك بیستن سەبارەت بە ئیسلام و پێغەمبەرەکەی، جیاوازی کردن

لەنێوان حەق و باتڵ دا بەلای ئەمانەوە گرنگ نیە، ئەمانە ئامانجیان تەنها تێرکردنی ئارەزووەکانیانە.

٤- هەرچی کۆمەڵی چوارەمیشە بە ئەهلی ئینساف و دادوەری دادەنرێن ، ئەمانە شارەزاییان سەبارەت بە ئیسلام و بنەما مرۆڤایەتیەکانی ئەم ئاینە هەیە، ئیسلام وەك ئەوەی کە هەیە دەیناسن، چاك لەو ڕاستیە گەیشتوون کە ئیسلام ئاینی دادوەری و ئاشتی و یەکسانیەو هۆکاری ڕزگارکردنی مرۆڤایەتیە لە قەیران و کێشەکان، ئەمانە لەدژی ئەوەن کە ئیسلام وەك ئاینی تیرۆرو توندڕەوی بناسرێت، دەتوانین بڵێین هەڵوێستی کۆمەڵی چوارەم بەرامبەر ئیسلام وەك هەڵوێستی ئەبوو تالیبی مامی پێغەمبەری خوایەو، چەندین هەڵوێستی جوان و مرۆڤانەیان بەرامبەر ئیسلام وپێغەمبەرەکەی (ﷺ) نواندووە، ئەم کۆمەڵەش زیاتر لە نوخبەی چینی توێژەرو ڕۆشنبیرەکان پێك هاتوون، بۆ نموونە وەك توێژەری فەرەنسی (جوسلین سیزاری) و ڕۆژنامەنووسی بەریتانی (روبرت فیسك) و (ماركوس بورج) ی مامۆستای زانستە ئاینیەکان لەزانکۆی (اوریغون) ی ئەمریکی، و (فرانسو یورجا) ی توێژەری بەناوبانگی فەرەنسی و (كارين امسترونج) ی نووسەری بەناوبانگی بەریتانی، کە ناوبراو خاوەنی چەندین کتێبە سەبارەت بەئیسلام و موسڵمانان و جوولەکە، هەروەها (تشارلز) ی جێگری شای بەریتانیا، ناوبراو گەورترین شاهێدی داو بەرپەرچی هەموو ئەو تۆمەتانەی دایەوە کە ئیسلامیان بە ئاینی توندو تیژی ناو دەبرد، بەڵێ (تشارلز) مێژوویەکی بۆ خۆی نەخشاندو بوو بە گەورەترین بەرگری کار لەئاینی ئیسلام! ناوبراو ڕاگەیاندنی چەواشەکاری ڕۆژئاوای دووچاری نا ئومێدی کرد! کە دەیان ویست ئیسلام بە تیرۆرو توندو تیژی بناسێنن، (تشارلز) هات ئەو هەموو فەزڵ و چاکانەی ئیسلامی بۆ کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی ڕوون کردەوەو هەمان کات کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی بەشێوەیەکی گشتی بە قەرزاری شارستانیەتی ئیسلامی زانی.

پێویستە کە موسڵمانان بەردەوام بەچاوی ڕێزەوە سەیری هەڵوێستی ئەم جۆرە کەسانە بکەن و سوپاسیان بکەن و، هەوڵ بدەن بە کردەوە جوانەکانیان بەرەو ئیسلام بانگهێشیان بکەن و هاوکاریان بن، هەتا زیاتر لەئیسلام شارەزا ببن و لەدڵ و دەروونیاندا زیاتر ئەم ئاینە خۆشەویست تر بێت.

٥- کۆمەڵی پێنجەمیش لەموسڵمانانی ڕۆژئاوا پێك هاتوون، ئەمانیش بەردەوام بە ڕەوشتە جوانەکانیان سەرنجی کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکانیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشاوە، لەلایەکەوە خەریکی بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلامن و هەمان کات بەردەوام بەرپەرچی ئەو پڕوو پاگەندانەش دەدەنەوە کە لەدژی ئیسلام و موسڵمانان بڵاو دەکرێنەوە، پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە ئەمڕۆ موسڵمانانی ڕۆژئاوا ڕاستەوخۆ نمایشی ئیسلام دەکەن وەك نوێنەری ئاینەکەی پەروەردگار لە ڕۆژئاوادا هەڵس و کەوت دەکەن. ! ئا ئەمەیە هۆکاری ئەوەی کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژمارەی موسڵمانان لەڕۆژئاوادا لەزیاد بووندایەو، زۆربەی ئەوانەیش کە موسڵمان دەبن لەچینی ڕۆشنبیرو زانا بەناو بانگەکانن‌و ئەم دیاردەیەش دەسەڵاتدارانی ڕۆژئاوای دووچاری شۆك کردووە !

## هۆکارەکانی سوکایەتی کردن بە پێغەمبەری خوا( ﷺ )

## هۆکارەکانی سوکایەتی کردن بە پێغەمبەری خوا( ﷺ )

### یەکەم: هۆکارە ( زاتی )و خودییەکانی سوکایەتی کردن بە پێغەمبەری خو( ﷺ ):

مەبەست لە هۆکارە خودیەکان ئەو هۆکارانەن کە بەناو ڕەگ و ڕیشەی دوژمنانی ئیسلام دا چوونەتە خوارەوەو، بەهۆیەوە هەموو هەوڵێکی خۆیان خستووەتە گەڕ لەپێناو دژایەتی کردنی ئیسلام وپێغەمبەرەکەی دا (ﷺ)، واتە ئەم هۆکارە خودیانە پەیوەندیان بەهیچ پاڵنەرێکی دەرەکیەوە نیە، بەڵکو زیاتر بەرقێکی ڕیشەداری مێژوویی دوژمنان بەرامبەر بەپێغەمبەرو ئاینەکەی لە قەڵەم دەدرێن، لێرەدا هەوڵ دەدەین کە ئاماژە بەو هۆکارانە بکەین و بەشێوەیەکی وردو بابەتیانە قسەیان دەربارە بکەین. !

### یەکەم: دژومنایەتی ئایینی:

خوای گەورە لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بەدژایەتی کردنی ئەهلی ئیمان کردوە لە لایەن(گاورو جولەکە)، کە بەردەوام ئەوان گاڵتەو قەشمەری بەئاینی ئیسلام دەکەن وەك دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَٱلْكُفَّارَ أَوْلِيَآءَ ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿٥٨﴾﴾ المائدة: ٥٧،٥٨.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، نەکەن ئەوانە بکەنە پشتیوان و جێگەی متمانەی خۆتان کە گاڵتەو گەمەیان بە ئاینەکەتان کردووە، چ لە خاوەنی کتێبی پێش خۆتان، چ لە بێباوەڕان، لەخوا بترسن و پارێزکار بن ئەگەر ئێوە باوەڕدارن، کاتێك ئێوە بانگ دەدەن بۆ نوێژ، نوێژەکەتان دەکەنە گەمەو گاڵتە، چونکە ئەوانە کەسانێکن بەڕاستی ژیر نابن و نافامن.

هەروەها سەبارەت بە هەوڵەکانی ئەوان بۆ گومڕاکردنی ئیمانداران‌و پاشگەزکردنەوەیان لە ئاینی ئیسلام دەفەرموویت: ﴿وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ءَامِنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓا۟ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَا تُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمْ قُلْ إِنَّ ٱلْهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ أَن يُؤْتَىٰٓ أَحَدٌ مِّثْلَ مَآ أُوتِيتُمْ أَوْ يُحَآجُّوكُمْ عِندَ رَبِّكُمْ قُلْ إِنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٧٣﴾﴾ ال عمران: ٧٢،٧٣.

واتە: دەستەیەك لە خاوەن کتێبەکان (جوولەکەکان) وتیان بە تاقمێکیان: ئێوە لە سەرەتای ڕۆژدا بە درۆوە باوەڕ بهێنن بەو قورئانەی کە بۆ ئیمانداران ڕەوانە کراوە، بەڵام لەکۆتایی ڕۆژو دەمەو ئێوارەدا پەشیمان ببنەوە بۆ ئەوەی ئەوانیش لەگەڵ خۆتاندا پاشگەز بکەنەوە، هەروەها دەڵێن: بڕواو متمانە مەکەن بە کەس جگە بەو کەسانەی کە شوێنی ئێوە کەوتوون. ! ئەی (محمد ﷺ) پێیان بڵێ: کە بەڕاستی هەر هیدایەت و ڕێنوێنی خوایی هیدایەت و ڕێنموونیە، کەچی جوولەکەکان بە یەکتری دەڵێن: دان بەوەدا مەنێن کە کەس وەکو ئێوەی پێ بەخشراوە باسی (تەورات و کۆتا پێغەمبەریش مەکەن) تا لای پەروەردگارتان و سبەی لە قیامەتدا قسەیان زاڵ نەبێت بەسەرتاندا، ئەی (محمد ﷺ) پێیان بڵێ: بەڕاستی هەرچی ڕێزو بەخشش و فەزڵ هەیە بەدەست خوایەو دەیبەخشێت بەو کەسانەی شایستەن ،بێ گومان خوا فراوانگیرو زانایە.

هەروەها بەردەوام لەنێوان پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوبەش پەیداکەراندا ململانێ هەبووە، ئەوان هیچ کات ئامادەیی ئەوەیان تێدا نەبووە کە لە بەرامبەر حەق و باتڵدا بێلایەن بن، بەپێچەوانەوە لە سەنگەری بەرگری کردنی هاوبەش پەیدا کەراندا بوون ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ

لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا ﴿٥١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَمَن يَلْعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴿٥٢﴾﴾ النساء: ٥١، ٥٢.

واتە: ئایا نەتزانیوە ئەوانەی بەشێك لە کتێبی ئاسمانیان پێدراوە کەچی لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕیان بە فاڵچی و جادووگەر و بت و پەیکەرو شەیتان هەیەو، دەربارەی ئەوانەی کە بێ باوەڕن دەڵێن: ئەوان چاکترن و ڕێبازی ڕاستتریان گرتووە، تا ئەوانەی کە باوەڕو ئیمانیان بە ئاینی ئیسلام هێناوە، ئەو جوولەکانە کەسانێکن خوا نەفرینی لێ کردوون، کەسێکیش خوا نەفرینی لێ بکات، ئەوە هەرگیز هیچ کەست دەست ناکەوێت بیکەیتە پشتیوانی.

هەروەها سەبارەت بە لایەنگری بەنی قورەیزە بۆ قورەیش و غەتەفان و سەرئەنجامیان دەفەرمووێت: ﴿ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴿٢٦﴾﴾ الاحزاب: ٢٦.

واتە: ئەوانەی پشتیوانی قورەیشیەکانیان کرد لە خاوەنی کتێبە ئاسمانیەکان لە جوولەکەکانی بەنی قورەیزە ،خوای گەورە لە قەڵاکانیان دایگرتن و ترس و بیمی خستە دڵیانەوە تا وایان لێ هات، ئێوە سەرئەنجام دەستەیەکتان لێ کوشتن و دەستەیەکی تریشتان لێ بەدیل گرتن.

لەبەر ئەوە لە چەندین جێگەدا قورئانی پیرۆز هۆشداری دەداتە باوەڕداران کە بە هیچ شێوەیەك جوولەکەو گاورەکان نەکەنە دۆست و پشتیوانی خۆیان وەك دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥١﴾﴾ المائدة: ٥١.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جوولەکەو گاور مەکەنە یارو یاوەرو پشتیوانی خۆتان، ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و پشتگیری یەکترن، ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت (حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت) بەڕاستی خوا هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات.

ئەم دوژمنایەتیە ئاینیە مێژووییەی گاورو جوولەکە لە بۆ ئیسلام هۆکارێکی سەرەکی بووە، هەتا ئاینی ئیسلام لەلایەن ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی و بێزەنتیەوە قبووڵ نەکرێت و، ڕێگە نەدەن کە ئاینی ئیسلام لە سنووری قەڵەمڕەوی دەسەڵاتیاندا بڵاو ببێتەوەو، سەرئەنجام شمشێریان بەرز کردەوە بەڕووی هەڵوێستی ئاشتیانەی ئاینی ئیسلامدا، ئیدی لێرەوە قۆناغەکانی فەتح و ڕزگاری دەستی پێ کردو، بەو هۆیەشەوە میللەتان و گەلانی عەجەم پۆل پۆل دەهاتنە ناو ئاینی ئیسلامەوە.

بەڵێ ڕۆژئاواییەکان لەدێر زەمانەوە لەتێڕوانینی ئاینی خۆیاندا ئەوەیان داوە بەگوێی وەچەکانیاندا کە پێغەمبەری ئاخیر زەمان(ﷺ) پێغەمبەری درۆینەیە. ! باشترین نموونەش کە دەیسەلمێنێت ئەوان لە دوژمنایەتی کردنی ئاینی ئیسلام دەست هەڵناگرن، ئەو هەڵوێستەی پاپا (بیندیکیت) ی شانزەیەمە، کە پاپا بەرزترین پلەی ئاینی یە لە ڕۆژئاواداو، ناوبراو بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە هێرشی کردە سەر ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ)، ئەمەش لەمیانەی کۆڕێکدا ڕایگەیاند کە لە زانکۆی (ریجستر) لە ١٢/ سێپتەمبەری ٢٠٠٦ دا بۆی گیرابوو، (بیندیکت) لەبەر دەم دەیان زانای ئەڵمانی دا هاتەگۆو وتی: نیشانم بدەن (محمد ﷺ) لەم سەردەمە نوێیەدا چی پێشکەش کردووە، جگە لە چەند کارێکی شەیتانی، (محمد ﷺ) هیچی پێشکەشی مرۆڤایەتی نەکردووە، بۆ نموونە بانگەشە دەکات بۆ بڵاو کردنەوەی ئاینەکەی بە زەبری شمشێر. ! !

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو کۆڕەکەی ناوبراو تایبەت بوو بە قسە کردن ، سەبارەت بە پەیوەندی نێوان باوەڕو لۆژیک و گرنگی گفتوگۆکردن لەنێوان ئاینەکاندا ! پاپا خۆی چاك لەو ڕاستییە تێگەیشتووەکە ئەو قسانەی ئەو ، بۆچوونی

زۆربەی هەرە زۆری شوێن کەوتووانی ئاینی مەسیحیەو هەموویان پشتگیری ئەو بۆچوونانە دەکەن.! ئەم هێرشە ناڕەوایەی پاپا هاوکاتە لەگەڵ ئەو هێرشانەدا کە ئیسلام بەتیرۆرو تۆقاندن ناو دەبەن، ئەمەش زنجیرە هێرشێکی بەرنامە بۆ داڕێژراوە، لەلایەن ڕاگەیاندن و دەسەلاتدارانی ڕۆژئاواوە سەرۆکایەتی دەکرێت و ، بەردەوامیش لەلایەن کەنیسەوە هێرش دەکرێتە سەر ئاینی ئیسلام و بێ ئەدەبی دەکرێت لە بەرامبەر چاکترین درووست کراوی خوادا کە ئەویش پێغەمبەری ئاخیر زەمانە(ﷺ).

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کاتێك پاپا ئەم ژەهرەی ڕشت ! ئەمریکا یادی پێنج ساڵەی ڕووداوی یانزەی سێپتەمبەری دەکردەوە، لەو ساتە وەختەدا کە جیهانی ڕۆژئاوا پرسیاریان دەکرد سەبارەت بەداهاتووی پەیوەندیەکانیان لەگەڵ جیهانی ئیسلامی دا،پاپا بەشێوازێك قسەی دەکرد وەك ئەوەی خۆی بڕیاردەرەی سەرەکی بێت سەبارەت بەداهاتووی پەیوەندیەکانیان لەگەڵ جیهانی ئیسلامی دا ،کە بێگومانیش هەروا بوو؟ چونکە کەنیسە بچووکترین ڕەخنەی ئاراستەی پاپا نەکرد چ جای ئەوەی کە لێپێچینەوەی لەگەڵ دا بکەن و سزای بدەن.

**دووەم: کینەی مێژوویی:**

مەبەست لە کینەی مێژوویی ئەو کاریگەریانەن کە بەهۆی فتووحاتە ئیسلامیەکانەوە لە دەروونی دوژمنانی ئیسلام دا درووست بوون، لەکاتێك دا سوپای ئیسلامی دەستی کرد بە ڕزگار کردنی وڵاتی شام و میسرو ئەنادۆڵی تورکیاو ئەندەلووس و ڕۆژهەلاتی ئەورووپا، هەروەها جەنگی (ئەجنادین و یەرموك و فەتحی قودس و عموریەو زەلاقەو (حطين) و ڕزگار کردنی قودس لە دەستی خاچ پەرستان و ڕزگار کردنی قوستەنتینیە) ، ئەمانە هەموویان کۆمەڵە ڕووداوێکی زۆر گەورەن و هەموو سەردەمێك لە بیرەوەری ڕۆژئاواییەکاندا بوونیان هەیەو، هەمان کات بوونەتە گرێیەکی گەورەو بەردەوام لەدووی هەلێك دەگەڕێن هەتا تۆڵەی خۆیان لە موسڵمانان

بکەنەوە، وەك دەزانین لە جەنگی خاچ پەرستان دا بەشێکی تۆڵەی خۆیان لە جیهانی ئیسلامی کردەوە، چەندین قەسابخانەو کردەوەی دڕندانەیان لەدژی موسڵمانان ئەنجام دا، کە لێرەدا دەکرێت (محاکم التفتیش) بە گەورەترینی ئەو قەسابخانانە دابنێین لە مێژووی جەنگی خاچ پەرستان دا لەدژی موسڵمانان، ئیدی با ئەو هەموو کارەساتانەی سەردەمی نوێ لەولاوە بووەستن کە بەناوی تیرۆرەوە سەپاندیانن بەسەر موسڵماناندا، بەو بیانووەوە تۆڵەی ڕابردووی خۆیان کردەوە.

بێ گومان خاچ پەرستان تۆڵە سەندنەوەی ئێستایان بە قەرەبووکردنەوەی ڕابردوو دەزانن ! تۆڵەی دۆڕاوی و شکستی ئیمپراتۆریەکانیان لە ڕابردوودا لە موسڵمانانی ئێستا دەکەنەوە.

بەدڵنیاییەوە بەردەوام لەلای تاکی ڕۆژئاوایی (ترس لە ئیسلام) ترسێکە هەردەم لە نوێبوونەوەدایە، ئەمەش ئەم ڕق و کینە لێکی دەداتەوە کە باڵی کێشاوە بەسەر سیاسەتی ڕۆژئاوادا بەرامبەر بە جیهانی ئیسلامی لە سەردەمی نوێ دا:

١- گەلە کۆمەکردنیان لە خەلافەتی عوسمانی: خاچ پەرستان بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە خەلافەتی عوسمانی بڕووخێنن و دەیان ویست بەڕووخاندنی ئەو دەوڵەتە قەرەبووی ئەو ڕق و کینە مێژووییەیان بکەنەوە، بۆ ئەو مەبەستەو لەساڵی (١٩٠٧) دا بەریتانیا داوای کرد کە لیژنەیەك لەنێوان حەوت دەوڵەتە داگیر کەرە ڕۆژئاواییەکەدا پێك بهێنرێت، بۆ تاووتوێ کردنی ئەو مەترسیانەی کە ڕووبەڕووی بەرژەوەندیەکانی ئەو دەوڵەتانە بووەتەوە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیەوە،پاشان لیژنەکە ڕاپۆرتێکی بڵاوکردەوەو داوای کرد کار لەسەر لاوازکردنی دەوڵەتی عوسمانی بکرێت و دواتر هەوڵ بدرێت کە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی پارچە پارچە و دابەش بکرێن و، هەمان کات چەندین دەوڵەت لەچوار چێوەی قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی دا درووست بکرێن .

٢- کاتێك هێزەکانی بەریتانیا شاری قودسیان لەساڵی (١٩١٧) دا بە فەرمانـدەیی (لینبی) داگیر کرد، ناوبراو یەکەم فەرماندەی ڕۆژئاواییە کە چووبێتە ناو قودسەوە لەپاش ڕزگار کردنی لەلایەن سەلاحەدینی ئەیووبییەوە، (لینبی) لەگەڵ چوونە ناو قودسەوە ڕایگەیاند کە ئێستا شەڕی خاچ پەرستی کۆتایی هات، هەروەها پاش ئەوەی کە فەرەنسیەکان لە جەنگی (میسلون)ـی ساڵی (١٩٢١) دا شاری دیمەشقیان داگیر کرد، فەرماندەی هێزەکانی فەرەنسا جەنەڕاڵ غۆرۆ ڕۆیشتە سەر گۆڕەکەی سەلاحەدینی ئەیووبی و ڕایگەیاند: ئەی سەلاحەدین بڕوانە وا دووبارە گەڕاینەوە. !

٣- بە هەمان شێوە ئەو ڕق و کینە مێژووییە دانیشتووانی بۆسنەو هەرسك و ناوچەی بەلقانیشی گرتەوە، کە لەلایەن هێزە سرپییەکانەوە لەدژیان ئەنجام درا لەساڵانی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا، لەبەر چاوی هەموو جیهان دا چەندین قەسابخانەو کوشتنی بەکۆمەڵ لەلایەن سرپە خوێن مژەکانەوە ئەنجام دراو،بە ئاشکراو لە بەرچاوی ڕێکخراوەکانی ئافرەتان و مافی مرۆڤ دەیەها ئافرەت پاش ئەوەی کە لەبەرچاوی هاوسەرەکانی خۆیانەوە دەست درێژیان دەکرایە سەر، پاشانیش بە دڕندانەترین شێوە دەیانکوشتن.. لەو کاتەدا جیهان و شارستانی ڕۆژئاوا بەرامبەر ئەم کارەساتانە کەڕو بێ دەنگ بوون،ئەوەی کە سرپ ئەنجامی دا لە بۆسنەو هەرسکدا بە درۆ خەرەوەی هەموو درووشمە بریسکەدارەکانی ڕۆژئاوا بوون سەبارەت بە ئازادی و، سەربەستی لە ئاین و فرەیی لە ڕەگەزو ئاینداری دا. ! !

٤- لەپاش ڕووداوەکانی یانزەی سێپتەمبەر ئەو ڕاستیە بە هەڵە لەزاری جۆرج بۆشی کوڕ دەرچوو و ڕایگەیاند: ئەمە جەنگی خاچ پەرستیە. ! ! هەرچەندە دواتر بە فشاری دەورووبەری داوای لێبوردنی کرد، بەڵام دەبێت ئێمەی موسڵمان ئاگاداری ئەوە بین و بزانین کە ئەمە ڕاستیەکەو لەناخی هەموو تاکێکی ڕۆژئاوایی دا ڕەگ و ریشەی قووڵی داکوتاوە، پێویستە ئێمە لەو کینە مێژووییەی ئەوان پەند وەربگرین.

٥- قەشەی بەناو بانگی ئەمریکی (فیلیب بینهام) بەردەوام لەڕێی دوانگەی ڕاگەیاندنەکانەوە، داوای ئەنجامدانی هەڵمەتێکی خاچ پەرستی دەکات بۆ ئاشکرا کردنی ئەو درۆیانەی خۆی وتەنی کە ناوی نراوە ئیسلام، هەتا لەو ڕێگایەوە ئەمریکا لە شەڕو خراپەی ئیسلام ڕزگار بکرێت، هەمان کات ناوبراو پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەوە تۆمەتبار دەکات کە هۆکاری لەناو چوونی دەیان ملیۆن کەسە لەو کاتەوە کە وەك فریاد ڕەس بۆ ڕزگار کردنی مرۆڤەکان نێردراوە.

کەواتە ئێمەی موسڵمان لە بەردەم کەلتوورێکی مێژوویی کەنیسەو پیاوانی سیاسی ڕۆژئاوادایین، ئەو کەلتووره پڕە لە ڕق و کین و بوغز لەدژی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی، تەنها هۆکارێك ببێتە فاکتەری بەهێز کردنی موسڵمانان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕۆژئاوا، گەڕانەوەیە بۆ پەیامەکەی پەروەردگارو پەرە دانە بە گیانی یەکبوون و برایی و نەفرەت کردنە لە جیاوازی و جیایی.

٦- لێرەدا پێم خۆشە ئاماژە بە شتێك بکەم کە لەلایەن (عەلا بیومی) بەڕێوەبەری کاروباری عەرەب بە بەڵگە هێنراوەتەوە دەربارەی کاریگەری جەنگی خاچ پەرستی لە دەروونی ڕۆژئاواییەکان داو تێڕوانینیان سەبارەت بە ئیسلام ، ناوبراو دەڵێت: (هەر یەکە لە (دیفید بلانکس و مایکڵ فراستۆ) هەستاون بە ئامادەکردنی کتێبێك سەبارەت بە تێڕوانینی ڕۆژئاواییەکان بۆ ئاینی ئیسلام لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، لەپێشەکیەکە دا ئاماژەیان بەوە کردووە کە لە ڕەگ و ڕیشەدا دژایەتی و ڕق و کینی ڕۆژئاواییەکان لە ئیسلام و موسڵمانان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی یانزەیەمی زاینی ،کە تیایدا سەرەتاکانی جەنگی خاچ پەرستی سەری هەڵداو قۆناغەکانی گەشەو جووڵەی زایۆنی و ڕۆژئاوایی هاوچەرخ دەستی پێکرد، هەروەها ئاماژە بەوە دەکەن کە ڕۆژئاواییەکان بە ئەنقەست خۆیان وەك ڕکەبەرێکی سەرسەختی ئیسلام و موسڵمانان نیشان دەدەن و هەوڵ دەدەن وێنەی ڕکابەرەکانیان (موسڵمانان) لە جیهاندا لەکەدارو بێزراو بکەن و،بەردەوام بەنیازن لەسەر حسابی موسڵمانان مێژووی خۆیان جوان

بكەن، هەر لە هەمان كتێبدا (دانیال فیتكس) كە مامۆستایە لە كۆلیژی ئادابی زانكۆی فلۆریدادا دەڵێت: تێڕوانینی نوێی ڕۆژئاوا بۆ ئیسلام لەو ساتەوە سەری هەڵدا كە پەیوەندی ڕۆژئاوا لەگەڵ ئیسلام و موسڵمانان دا پەیوەندیەك بوو لەسەر بنەمای ترس و دڵەڕاوكێ بنیات نرابوو، ئەمە پاڵی بە ڕۆژئاواییەكانەوەنا بەو شێوازە ئیسلام بناسێنن كە خۆیان دەیانەوێت، ئاینی ئیسلامیان بە ئاینێكی تەسك و داخراو و پڕ لە توندو تیژی و ئارەزووات ناو دەبردوو وەهایان نیشان دەدا كە ئیسلام لە دونیادا بەهۆی توندو تیژی و جیهادەوە بەردەوامی دەدا بەمانەوەی خۆی ! هەمان كات موسڵمانان وازیان لە خۆشیەكانی دونیا هێناوەو هەرچی تام و چێژی سێكسیشە ئەوا خوای گەورە بەڵێنی پێداون لەو دونیادا قەرەبوویان بۆ بكاتەوە.

### سێیەم: دەمارگیری نەتەوەیی (گیانی بەرز خوازی):

دەمارگیری نەتەوەیی (گیانی بەرز خوازی) و خۆ بە پەسەند زانی بەسەر ڕەگەزو نەتەوەكانی دیكەدا، یەكێكی دیكەیە لە هۆكارەكانی دەست درێژی كردنە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بەردەوام ڕۆژئاواییەكان وەك كۆیلە سەیری گەلانی ڕۆژهەڵات دەكەن، ڕۆژئاواییەكان بۆچوونیان وەهایە كە تەنها سپی پێستە ڕۆژئاواییەكان مافی ئەوەیان هەیە، سەردارو پێشەوای جیهان بن و ئەوان گونجاو و لەپێشترن تا ببنە فەرمانداری جیهان، لەسەر ئەم بنەما فاشیانەش بوو كە لە ڕۆژئاوادا چەندین جەنگی نەتەوەیی سەریان هەڵدا، ئەگەر ئەوروپا لەساتێكی مێژوویی دیاری كراو دا لە دەمارگیری ئاینی نەسرانی ڕزگاری بووبێت ! ئەوا هەرگیز ناتوانێت تەنانەت بۆ ساتێكیش خۆی لەدەمارگیری ڕەگەزی (جنسی) ڕزگار بكات، ئەمە باوەڕ و تێڕوانینێكە بەناخی ڕۆژئاواییەكان دا چووەتە خوارەوە و بەو شێوازە لە مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی و بەتایبەت موسڵمانان دەڕوانن و خۆیان بە پێشكەوتوو و موسڵمانان بەدوا كەوتوو دەزانن، ئەوەی كە هاندەری ڕۆژئاوایە بۆ ئەو یاخی بوون و خۆ بە پەسەند زانینە،

گۆڕانکاری و پێشکەوتنە سیاسی و پیشەسازی و تەکنیکیەکانن کە ڕۆژئاوا بەدەستی هێنان لە دوو سەدەی ڕابردوودا، هەمان کات ڕووخان و بە چۆکدا هاتنی یەکێتی سۆڤیەتیش لە بەرامبەر ڕۆژئاوادا هۆکارێکی دیکەیە.

ئەم دەمارگیری و خۆ بە پەسەند زانینەی ڕۆژئاواییەکان تەنها ڕووبەڕووی موسڵمانان و ئەفریقیەکان نەبووەتەوە، بەڵکو ئەم دەمارگیریە سەری کێشاوە بۆ ئەوەی کە ئاینی خۆیان بە سەردارو پێشەوای هەموو ئاینەکانی تر بزانن، ئەوەتا (زفیسفولود) لەیادی (٩٥٠) ساڵەی پەرت بوونی کەنیسەی مەسیحیەکان دا دەڵێت: بۆ دووبارە گەڕاندنەوەی یەکبوونی ئاینی نێوان مەسیحیەکان، پێویستە کەنیسەی کاسۆلیکی گۆڕانکاری لە سیاسەتی خۆیدا بکات و لەسیاسەتی دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان دوور بکەوێتەوەو، بگەڕێتەوە بۆ باوەڕێکی ڕاستەقینە بە خوای گەورە.

هەروەها (تشابلین) بۆچوونی وەهایە دابەش بوونی کەنیسە لە ڕابردوودا بڕیارێکی ئاینی نەبووە بەڵکو مەرامێکی سیاسی لە پشتەوە بووە، ئەمەش لە ئەنجامی گیانی خۆ پەسەندی ڕۆژئاواوە ڕوویدا!

بەدڵنیاییەوە ئەو شارستانی و وێنە جوانەی ئیسلام کە لە هەموو ڕوویەکەوە لە ڕابردوودا پێشکەشی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کردووە، هەروەها ئەو نموونە جوانەی شارستانی پاڵپشت بە وەحی ئیلاهی کە لە ئەندەلووس دا پێشکەشی کرد، ئەمانە هەموویان کاریگەرییان لەسەر ڕۆژئاواییەکان بەجێ هێشت و هاندەریان بوو بۆ ناشیرین کردنی وێنەی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم)، کە ڕەنگە لێرەدا کتێبی (موحەممەدو دەمارگیری) ڤۆڵتێر باشترین نموونە بێت لەو ڕووەوە، ناوبراو بەشێوازێکی نا شایستە باس لە پێغەمبەری ئازیزمان (صلى الله عليه وسلم) دەکات و دەست درێژی دەکاتە سەر کەسایەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، هەروەها (جۆرج بۆش)ـی باپیر لەساڵی (١٨٣١) دا کتێبێکی پڕ لە درۆی لەدژی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نووسیوە بەناوی (ژیانی موحەممەد)، لەوێندەر ناوبراو ڕق و کینی خۆی سەبارەت بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و ئیسلام و

موسڵمانان هەڵڕشتووەو تیایدا هاتووە (هەتا ئیمپراتۆریەتی موسڵمانان لەناو نەبرێت، خوا ڕێگە نادات کە جوولەکە بەسەر بەرزی و بەبێ ترس بگەڕێنەوە بۆ زێدی باب و باپیرانیان).

قورئانی پیرۆز ئاماژە بەو (گیانی بەرز خوازیەی) گاورو جوولەکە دەکات و دەفەرمووێت: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَـٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَـٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّـٰٓؤُهُۥ ۚ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ۖ بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾﴾ المائدة: ١٨.

واتە: جوولەکەو گاورەکان دەیان وت: ئێمە ڕۆڵەی خواو خۆشەویست و نزیکی ئەوین، پێیان بڵێ ئەی (محمد ﷺ) کەواتە بۆچی لەسەر گوناهو تاوانتان سزاتان دەدات، نەخێر وا نیە، چونکە ئێوەش بەشەرو ئادەمیزادێکن وەك ئەو خەڵکەی کە دروستی کردوون، ئەوەی خوای گەورە بیەوێت لێی خۆش بێت، لێی خۆش دەبێت، ئەوەش کە بیەوێت سزای بدات، سزای دەدات، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی و نێوانیاندا هەیە خوا خاوەنیانە، گەڕانەوەو سەرئەنجامیش هەر بۆ لای ئەو زاتەیە.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿...ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ لَيْسَ عَلَيْنَا فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٌ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ ال عمران: ٧٥.

واتە:... ئەوانە بۆیە وا دەکەن چونکە دەڵێن: لە بەرامبەر دەستەی نەخوێندەواراندا (مەبەست موسڵمانانە) لێپرسراو نابین (ئەگەر فێڵیان لێ بکەین وماڵیان بخۆین، ئا ئەوانە بەدەم خوداوە درۆ هەڵدەبەستن و دەشزانن کە درۆ دەکەن).

بەدڵنیاییەوە گاڵتە کردنی خاوەن کتێبەکان (گاور، جوولەکە) بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، هۆکارەکەی بۆ بوونی (گیانی بەرز خوازی) ئەوان دەگەڕێتەوە، پێیان نەنگە کە ئەو پێغەمبەری ئاخیر زەمانەو هەمان کات لە وەچەو ڕەگەزی خۆیان نییەو

ڕۆژهەلاتییـــــە ﴿وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ﴾ البقرة: ٨٩.

واتە: ئەوان پێشتر داوای سەرکەوتن و زاڵ بوونیان بەسەر ئەوانەی بێ باوەڕ بوون لەخوا دەکرد بەهۆی شوێنکەوتنیان بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، کەچی کاتێك ئەو پێغەمبەرەیان بۆ هات کە دەیانناسی بڕوایان پێ نەکرد، کەواتە با نەفرین و لەعنەتی خوا لەسەر کافران بێت. !

ئەم گیانی بەرز خوازیەی ڕۆژئاواییەکان سەری بۆ ئەوە کێشاوە کە جیهان بەسەر دوو بەرەدا دابەش بکەن، ڕۆژئاوا بە سەردارو خاوەن شارستانی جیهان دەزانن ! ڕۆژهەلاَت و گەلە هەژارەکانیش بە کۆیلەو دواکەوتوو و وابەستەی خۆیان دەزانن، هەر ئەم هۆکارەش هاندەریانە کە چەندین وشەی لە ڕوواڵەتدا جوان و بێ ناوەڕۆکیان داهێناوەو بە کوتەك بە گەلانی ڕۆژهەلاَتی دەفرۆشنەوە وەك: دیموکراسی،مافی ژنان، بازاڕی ئازاد، فرەیی، ئازادی کەسی و... هتد ئەمانە کۆمەڵە دەستەواژەیەکی بریسکەداری ڕۆژئاواییەکانن و بەهۆیانەوە دەست دەخەنە ناو کاروباری وڵاتانی ڕۆژهەلاَتەوە و ئیرادەی گەلەکانیان بۆ خۆیان دەبەن و داگیریان دەکەن.

لەبەر ئەوە نابێت لەلامان نامۆ بێت کە ڕۆژئاواییەکان بەردەوام وەك پێگەی شەڕ سەیری ڕۆژهەلاَت و بەتایبەت وڵاتە ئیسلامیەکان دەکەن و، بەبیانووی نابەجێوە هەوڵی لاواز کردنی ئەو وڵاتانە دەدەن کە سەر نەوی ناکەن بۆ داواکانیان. ! ئایا ئەوە ڕۆژئاواییەکان نین کە لە عێراق و ئەفغانستان و صۆماڵ و سوداندا قەسابخانە دەنێنەوەو داگیریان دەکەن.

## دووەم: هۆکارە دەرەکییەکانی دەستدرێژیکردنی سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ):

مەبەست لەو پاڵنەرو هۆکارانەیە کە کاریگەرییان هەیە لەسەر زیادبوونی دەست درێژی کردنە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) و گاڵتە پێ کردنی، کە لەم سەردەمە نوێیەدا هەر یەکە لەو پاڵنەرو هۆکارانە بوونیان هەیە، لەوانەش:

### ترس لە ئیسلام:

بڵاو بوونەوەی ئاشتیانەو کشانی ئاینی ئیسلام بەرەو ئەورووپاو وڵاتانی خاچ پەرستی، ئەوانی دووچاری دڵگرانی و ترس کردووە، بەدڵنیاییەوە ئەمەش یەکێکە لە پاڵنەرو هۆکارەکان و وەك پەرچە کردارێکی توند، هیچیان پێ ناکرێت بە ناچاری هێرش دەکەنە سەر ئیسلام و موسڵمانان، تەنانەت لە ئێستادا ئاینی ئیسلام بە دووەمین ئاینی ڕەسمی دادەنرێت لە وڵاتانی (سوید، نەرویج، فەرەنسا، دانیمارك) دا.

ژمارەی موسڵمانانی سوید لە ئێستادا زیاترە لە نیو ملیۆن موسڵمان، لە نەرویج دا زیاتر لە دوو سەدو حەفتا هەزار موسڵمان هەیە،لە دانیمارکیش دا نزیکەی دووسەد هەزار موسڵمان هەیە،لە فللەندەش زیاتر لە پەنجا هەزار موسڵمان هەیە،ژمارەی موسڵمانانی بەریتانیاش زیاترە لە دوو ملێون کەس،لە فەرەنساشداژمارەی موسڵمانان نزیکەی پێنج ملیۆن موسڵمانە،ئەمریکا ! ئەو وڵاتەی کەبەناوی تیرۆرەوە پێشڕەوایەتی دژایەتی ئیسلامی لە ئەستۆ گرتووە لە ئێستادا زیاتر لە سیانزە ملیۆن موسڵمانی تێدایە ! گەشەکردن و بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە ڕۆژئاوادا بەو خێراییە، تەواو دوژمنانی ئیسلامی تۆقاندووەو ! ڕێکخراوەکانی مەسیحی و جوولەکە ئەمە بە هەڕەشە دەزانن بۆ سەر ئەو کۆمەڵگایانە، ئیدی لێرەوە دەستیان کرد بە ئەنجامدانی چەندین توێژینەوە لە ڕووی (کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و بیروباوەڕەوە) و دەیان ویست ئەو هۆکارانە بزانن کە ڕێ خۆشکەری خێرا بڵاوبوونەوەی ئیسلامن لە ڕۆژئاواداو، چەندین توێژەری جوولەکە ئەو ڕاستییەیان دوپات کردەوە کە داهاتووی قەوارەی زایۆنی لە

مەترسیدایە؟ دڵگرانی خۆیان نەشاردەوەو چەندین جار ئاماژەیان بەوە کرد کە ئەگەر چارەسەرێك بۆ بڵاوبوونەوەی ئیسلام دانەنرێت لە ڕۆژئاوادا، ئەوا بەبێ گومان شوێن کەوتووەکانی (محمد ﷺ) و وەچەی سێیەمی موسڵمانان کە لەم وڵاتانەدا لەدایك بوون لە داهاتوودا دەگەنە ناوەندەکانی بڕیار لە ڕۆژئاوادا! کەواتە خێرا بڵاوبوونەوەو گەشەکردنی ئیسلام لە ڕۆژئاواداو سەلماندنی بوونی خۆی، پاڵنەرێکی سەرەکیە و لە بەرامبەردا گەورە بەرپرسانی سیاسی و ئاینی ڕۆژئاوا بە جۆرێکی ترسنۆکانە، داخی دڵی خۆیان لە دژی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەڕێژن و هەوڵ دەدەن بەو شێوازە تۆڵە لە ئیسلام و موسڵمانان بکەنەوە.

بەڵێ! شاڵاوی موسڵمان بوون لە ڕۆژئاوادا بوەتە جێگەی سەرنجی هەموو لایەك ،تەنانەت ئەو سەربازانەی ڕەوانە دەکرێن بۆ جەنگ کردنی موسڵمانان لەجیهانی ئیسلامی دا،هەر ئەوەندەی موسڵمانێك دەمی پێیان دەگات ڕاستەوخۆ بڕوا بە ئیسلام دەکەن و موسڵمان دەبن!

لەم بارەوە دکتۆر زەغلول نەججار دەڵێت: توانیمان بە یارمەتی پەروەردگار لەو پێنج سەد هەزار سەربازو ئەفسەرەی کە هاتبونە ناوچەی کەنداو، بیست هەزار کەسیان لێ موسڵمان بکەین بەپیاوو ئافرەتیانەوە،زۆربەیان چوون بۆ ئەنجامدانی حەج و عەمرە!هەندێکیان نیوەی مووچەکەیان دابین دەکرد بۆ هەدیە کردنی قورئان هەتا لە گەڕانەوەیاندا بەدیاری بیدەنە خۆشەویستانیان!

موسڵمان بوون لە ڕیزی هونەرمەندو گۆرانی بێژو زانایان و توێژەراندا بووەتە دیاردەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش لە ناو هاوڵاتیانی ڕۆژئاوادا! بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش خەڵکی هەژارو بێنەواو زیندانیەکان ڕوو لە ئیسلام دەکەن،لەمانەش سەیرتر خەریکە موسڵمان بوون لە ناو قەشەو پیاوانی ئاینی و نزیکەکانی پاپادا دەبێتە دیاردە،لەیەکێك لە کۆڕەکاندا بەیەك جار سی قەشەی ڤاتیکان موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند!

## ڕووداوەکانی یانزەی سێپتەمبەر:

ئەمەش هۆکارو بیانوویەکی ترە بەدەست دوژمنانەوە، هەتا هێرشەکانیان بۆ سەر ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) پەرە پێ بدەن، لەپاش ڕووداوەکانی یانزەی سێپتەمبەرەوە بە ئاشکرا هێرش دەکرێتە سەر ئیسلام و پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، بێ ئەدەبی کردن بە پیرۆزیەکانی موسڵمانان لەسەر ئاستی جیهان بووە بە دیاردەیەکی بەربڵاو.

لەڕاستیدا ژیانی موسڵمانان لە ناوچەکانی باکووری ئەورووپادا زۆر ئاسایی بوو و لەخۆشیدا دەژیان، هەتا ئەو کاتەی ڕووداوەکانی یانزەی سێپتەمبەر ڕوویاندا، ئیدی لێرەوە ئەمریکا توانی ژیانی موسڵمانانی باکووری ئەورووپاش تاڵ بکات و هۆشداری ئەوەی دەدا کە موسڵمانان مەترسین بۆ سەر ئەورووپاو ڕۆژئاوا.

لەکاتێکدا لەلایەن یەکێتی ئەورووپاوە ڕاپرسیەك سەبارەت بە خراپ ترین و بەدترین دەوڵەت لە جیهاندا بلاَو کرایەوە، لە ئاکام دا ئەنجامی ڕاپرسیەکە قەوارەی ئیسرائیلی بە خراپ ترین و بەدترین دەوڵەت ناوبرد لەسەر ئاسایش و هێمنایەتی لە جیهاندا، ئەم ڕاپرسیەش لەناو هاوڵاتیانی ڕۆژئاوادا ئەنجام درا. !

سەیرە لە جیاتی ئەوەی سنوورێك بۆ قەوارەی زایۆنی دابنرێت، پاش ڕاپرسیەکە ڕاستەوخۆ چەندین هێرشی بەرنامە بۆ دارێژراو دەستیان پێکرد لەدژی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) و لەو نێوەندەدا قەشەیەکی سویدی بەناوی (لوناردو سوغارد) لە لێدوانێکی دا ڕایگەیاند (موحەممەد پێغەمبەرێکی عەرەبی داخراو بووەو ....!).

لەلایەکی دیکەوە ڕادیۆی ناوخۆیی دانیمارك داوای کرد کە هەموو موسڵمانانی دانیمارك دەربکرێن. ! پاشان هێرش کردنە سەر موسڵمانان وردە وردە سەری لەوەوە دەرچوو کە وێنەی کاریکاتێری لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) بلاَوبکەنەوە و بە ئاشکراش گەورە بەرپرسانی هەندێ لە وڵاتانی نەرویج و دانیمارك دژایەتی خۆیان بەرامبەر

ئیسلام و موسڵمانان ڕاگەیاندو داوای ئەوەیان دەکرد کە پێویستە موسڵمانان داوای لێبووردن بکەن. !

سەرژمێرییەك لە هۆڵەندا ئاشکرای کرد کەپاش ڕووداوەکانی یانزەی سێپتەمبەر ئیسلام یەکەمین ئاینە لە ئەمستردامی پایتەختدا! لەم بارەوە ڕۆژنامەی (مترۆ) ی هۆڵەندی ڕایگەیاند: لە سەدا سیانزەی دانیشتوانی ئەمستردام موسڵمانن و! ڕێژەی کاسۆلیك لە سەدا دەیەو ،پرۆتستانت لە سەدا پێنج و جولەکەش لە سەدا یەك،ڕۆژنامەکە لە درێژەی ڕاپۆرتەکەیدا دەڵێت: ئەمەش هۆکارێکی سەرەکیە هەتا زۆر لە دەزگا ئاینیەکان (جگە لە ئیسلام) دەرگاکانیان دابخەن و کەلوپەلەکانیان بفرۆشن!

هەر سەبارەت بە یانزەی سێپتەمبەر دەزگای هەواڵگری ئەمریکی (cia) لە ڕاپۆرتێکدا هۆشداری و نیگەرانی خۆی ڕادەگەیەنێت و دەڵێت: (لە ئێستادا ئیسلام لە هەموو ئاینەکانی تر خێراتر بڵاو دەبێتەوە! ژمارەی موسڵمانان دەگاتە سێ یەکی دانیشتوانی جیهان) هەروەها ڕاپۆرتەکە ئاماژە بەوە دەدات کە ڕووداوەکانی یانزەی سێپتەمبەر سوودی موسڵمانانی تێدا بووە !بەڕادەیەك کە پاش ئەو ڕووداوە ڕێژەی موسڵمان بوون زۆر زیادی کردووە بەتایبەت لە ئەمریکاو ئوستوڕالیاو ناوچەکانی ڕۆژئاوادا!

## زیاد بوونی ژمارەی مزگەوتەکان و بڵاو بوونەوەو زۆر بوونی فرۆشی قورئان و کتێبە ئیسلامیەکان:

زیاد بوونی ژمارەی مزگەوتەکان لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا، هۆکارێکی دیکەیە بۆ زیاد بوونی ترسیان لە ئیسلام و موسڵمانان. ! تەنانەت لە زۆر ناوچەی ڕۆژئاوادا مزگەوتەکان کێ بەرکێی ژمارەی کەنیسەکان دەکەن بەتایبەت لە پاریس و لەندەن و مەدریدو ڕۆماو نیۆرك دا، تەنها لە ئەمریکادا زیاتر لە دوو هەزار مزگەوت هەیە، لە فەرەنساشدا زیاتر لە هەزارو شەش سەد مزگەوت بوونی هەیەو،ئەمە لەکاتێکدایە کە

ژمارەی مزگەوتەکان لە فەرەنسادا زۆر کەمترن لە چاو ئەو ڕێژە زۆرەی موسڵمانانەدا کەلەو ولاتەدا هەن و لەو ڕووەوە مزگەوتەکان بەشی نوێژ خوێنان ناکەن! ژمارەی مزگەوتەکان لە ئەڵمانیاش دا زیاترەلە دووهەزارو دووسەد مزگەوت و، لە بەلجیکاش زیاتر لە سێ سەدمزگەوت هەیە، لە هۆڵەنداشدا زیاتر لە چوارسەد مزگەوت و لە ئیتاڵیاشدا زیاد لەسەدوسی مزگەوت هەیە،نوێترین ئاماریش دەری دەخات کە لە ولاتی ئیسپانیادا زیاتر لە چوار سەد مزگەوت هەیە، سوپاس بۆ خوای گەورە زۆربەی ئەو مزگەوتانەی ئەمڕۆ لە ڕۆژئاوادا بوونیان هەیە کەنیسە بوون، دوای ئەوەی لەلایەن موسڵمانانەوە کڕدراون پاشان کردوویانن بە مزگەوت! ئامارەکان ئاماژە بەوە دەدەن ساڵانە زیاتر لە شەست کەنیسە لە بەریتانیا دادەخرێن ! لەماوەی سی ساڵی ڕابردوودا زیاتر لە (١٦٢٦) کەنیسە داخراون،مایەی خۆشحاڵیە لەئێستادا ئیفلالس بوونی کەنیسەکان لە ڕۆژئاوادا بووە بە دیاردەو لەبەر ئەوەی توانای ئەوەیان نیە پارەی ئاوو کارەباو زەریبە بدەن ! ناچار بەهۆی قەرزارییەوە دەیان فرۆشن و دواتر موسڵمانان دەیان کڕنەوەو دەیانکەن بە مزگەوت!

تەنانەت لە ئێستادا مەسیحی وقەشەکانیان خۆیان داوا لەبانگ خوازانی ئیسلام دەکەن ،هەتا بڕۆن لەکەنیسەکانیاندا ئیسلامیان بۆباس بکەن و زانیارییان بدەنێ سەبارەت بەم ئاینە (الله أكبر)!

هەروەها زۆر بوونی فرۆشی قورئان و کتێبە ئیسلامیەکان وەهایان لە دوژمنان کردووە کەزیاتر لە ئیسلام بترسن و، هەمان کات بوونەتە ڕێگر لە بەردەم بانگەوازی خوایی دا بەتایبەت لە پاش ڕووداوەکانی یانزەی سێپتەمبەر، هەروەك بەدیوێکی تردا دەتوانین بڵێین ڕووداوەکانی یانزەی سێپتەمبەر بە خێر بۆ ئیسلام و موسڵمانان گەڕایەوە. ! چونکە لە پاش ئەو ڕووداوانە ئەمریکاو ڕۆژئاوا کەوتنە دژایەتی ئەم ئاینەو بە ئاینی توندو تیژی ناویان دەبرد، ئیدی هاولاتیانی ڕۆژئاوا کەوتنە هەوڵی دەست خستنی قورئان و کتێبە ئیسلامیەکان هەتا ئیسلام وەك خۆی بناسن، پاش ئەوەی

ڕاستیەکانیان بۆ دەرکەوت.! دەبینین ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئیسلام لە ڕۆژئاوادا لە گەشەکردندایەو لە ئێستاشدا قورئانی پیرۆز بە پڕ فرۆشترین کتێب دادەنرێت لە بازاڕەکانی ئەمریکاو ڕۆژئاوادا!

## وریایی دانی ڕۆژنامەکانی ڕۆژئاوا سەبارەت بە بڵاوبوونەوەی ئیسلام:

لە ئەنجامی ئەو گەشە خێرایەی کە ئیسلام لە ئەوروپادا بەخۆیەوە بینی، لە بەرامبەردا ڕاگەیاندنی ڕۆژئاواو بەتایبەت ڕۆژنامەکانیان چەندین جار وریایی و هۆشداریان داوە لە مەڕ خێرا بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە ڕۆژئاوادا! بەشێوەیەك بووەتە گەورەترین مەترسی لەسەر ئاینی خاچ پەرستی و کەنیسە، هەر لەم ڕووانگەوە ڕۆژنامەی (تایم)ـی ئەمریکی هۆشداری دەدات و دەڵێت: (خۆری ئاینی ئیسلام سەر لەنوێ هەڵهاتەوە، بەڵام ئەمجارە بە پێچەوانەی ڕابردوو و شوێنی جوگرافی خۆیەوە دەرکەوتەوە، لە ڕابردوودا ئیسلام لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدەهات، بەڵام ئەمجارە بەپێچەوانەوەو لەڕۆژئاواوە دەرکەوتووەتەوە).

هەروەها ڕۆژنامەی (سەندەی تەلەگراف) ی بەریتانی لە کۆتاییەکانی سەدەی ڕابردوودا ڕایگەیاند (لەگەڵ کۆتایی هاتنی ئەم سەدەیەدا ئیسلام بەشێوەیەکی بەرفراوان بڵاو دەبێتەوە، لەگەڵ هاتنی سەدەی نوێ دا واتە( ئەم سەدەیەی ئێستا ئێمەی تێدا دەژین ) خەڵکانی نا موسڵمان ڕوو دەکەنە دیراسەو خوێندنەوەی قورئان و کتێبە ئیسلامیەکان، ئیدی لە ئەنجامی ئەو توێژینەوەو خوێندنەوانەدا بۆیان دەردەکەوێت کە تەنها ئیسلام شایانی ئەوەیە بکرێتە بەرنامەی ژیان و مرۆڤەکان شوێنی بکەون ، هەر بە تەنها ئەم ئاینە توانای ئەوەی هەیە کە هەموو کێشەکانی مرۆڤایەتی چارەسەر بکات).

هەروەها گۆڤاری (لۆدینا) ی فەرەنسی لەپاش چەند توێژینەوەیەك کە چەندین پسپۆر ئەنجامیان داوە دەڵێت: (لە داهاتوودا ڕژێمێکی ئاینی دەست بەسەر جیهان دا

دەگرێت، بە دڵنیاییەوە ڕژێمی ئیسلامی لە داهاتوو دا جڵەوی فەرمانڕەوایی جیهان دەگرێتە دەست هەرچەندە ئێستا ئیسلام لاوازە، بەڵام لەڕاستی دا ئیسلام تەنها ئاینێکە بتوانێت بەشێوەیەکی ڕێك و پێك سەرپەرشتی جیهان بکات، چونکە ئەو ئاینە هێزێکی گشتگیری زۆر مەزن و گەورەیە).

لەساڵی ٢٠٠١ دا ڕۆژنامەی (نیوۆرك تایمز) بابەتێکی بڵاو کردووەتەوەو تیایدا ئاماژەی بەوە کردووە کە ساڵانە (٢٥) هەزار ئەمریکی موسڵمان دەبن و، هەمان کات پاش ڕووداوەکانی یانزەی سێپتەمبەر ژمارەی ئەو کەسانەی موسڵمان دەبن چوار قات زیادی کردووە بەپێی خەمڵاندنی چەند ناوەندێکی ئاینی!

**لەگەڵ ئەوەی ئەم ژمارە زۆرە لە ڕۆژئـاوادا موسـڵمان دەبـن، لـە هـەمان کـات دا پێویستە ئێمەی موسڵمان ئاگامان لەم چەند خاڵە بێت:**

١- ئەو بارودۆخەی کە دوژمنان سەپاندوویانە بەسەرماندا لە بەرژەوەندی ئیسلامو موسڵمانان دا نیە، ئەنجامدانی هەر پەرچە کردارێك کە پێچەوانەی خووڕەوشتە ئیسلامیەکان بێت سەر ئەنجام بە خراپ بەسەر موسڵمانان و ئاینەکەماندا دەشکێتەوە.

٢- ئەو هەوڵ و کۆششە بەرفراوانانەی کە گاورەکان گرتوویانەتە بەر، لەپێناو بە گاور کردنی جیهان دا.

٣- لەپاش ڕووداوەکانی یانزەی سێپتەمبەر، پارەی زۆرێك لە ڕێکخراوە ئیسلامیە خێرخوازیەکان بلۆك کرا، هەمان کات دوژمنان مەودای چالاکی و بانگەوازی ئیسلامیان زۆر بەرتەسك کردووەتەوە.

٤- دوژمنان هەژاری و بێ دەستەڵاتی و نە شارەزایی موسڵمانانیان سەبارەت بە ئیسلام قۆستوەتەوەو، هەوڵ دەدەن کە سەر لە موسڵمانان بشێوێنن و لە ئاینەکەیان دووریان بخەنەوە.

٥- پەیوەندی بەستنی دوو ڕووانی جیهانی ئیسلام ،لەگەڵ دوژمنانی ئیسلام و موسڵمانان دا.

٦- زۆربوونی ڕێژەی ئەو کەسانەی کە هێرش دەکەنە سەر پێغەمبەری خوا(ﷺ).

## هەڵوێستە سیاسیەکان:

ترسناکترین هۆکار بۆ زیاتر بوونی دەست درێژی کردنە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پاڵپشتی دەوڵەتانی ڕۆژئاوایە بۆ گەلەکانیان لەسەر ئەو دەست درێژی کردنانە، لەکاتێك دا موسڵمانانی دانیمارك کەژمارەیان زیاتر لە دووسەد هەزار کەسە ناڕەزاییان دەربڕی سەبارەت بەبێ ڕیزی کردن بە ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ)،لەو میانەدا یاداشتێکیان دا بەحکومەتی دانیمارك و داوای لێپێچینەوەیان کرد، لە بەرامبەردا حوکومەت یاداشتەکەی بەرپەرچ دایەوەو بەبیانووی ئازادی بیروڕاوە پشتگیری خۆی بۆ ڕۆژنامە دانیمارکیەکە دووپات کردەوە، داواکاری گشتیش فەرمانی هەڵگرتنی داوای یاسایی لەدژی ڕۆژنامەکە دەرکردو ڕایگەیاند: ئەو یاسایەی کە تایبەتە بەڕێگری کردن لە هێرش کردنە سەر ئاینەکان، ناتوانین لەدژی ئەم ڕۆژنامەیە بەکاری بهێنین. !

هەروەها (مارجریتی دووەم) کە پاشای دانیمارکە ڕایگەیاند: ئاینی ئیسلام گەورەترین مەترسیە بۆ سەر ئاسایش و هێمنایەتی دانیمارك و جیهان و،حکومەتەکەی زیاتر پێداگری دەکات هەتا هیچ جۆرە هاوکارییەك بۆ کەمینە موسڵمانەکان دابین نەکرێت،هەروەها ڕۆژنامەیەکی سویدیش هەمان هەڵوێستی هەبوو و ڕایگەیاند : بە هیچ شێوەیەك داوای لێبوردن لە موسڵمانان ناکەین.

هەروەك بەریتانیاش بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام و موسڵمانان،پشتگیری کەسێکی هەڵگەڕاوەی وەك سەلمان ڕوشدی نووسەری کتێبی (ئایەتە شەیتانیەکان)ـەو بە هەشت سەد هەزار دۆلار کتێبەکەیان لێ کڕی و، بە بیانووی ئازادی کاری نووسینەوە

چاپ و بڵاویان کردەوەو، هەروەها بۆ گاڵتە کردن بە هەست و سۆزی موسڵمانان، بیل کلینتۆنیش لە کۆشکی سپی پێشوازی لە سەلمان ڕوشدی کرد.

وەکاتێك ئافرەتێکی هەڵگەڕاوەی وەك (هرسی) کە بە ڕەگەز سۆماڵیە، قسەی بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وت.! لە بەرامبەردا پارتی سویدی پشتیوانی خۆی بۆ قەوارەی زایۆنی دووپات کردەوەو، هەمان کات لەلایەن حکومەتی دانیمارکیەوە پشتگیری لە بۆچوونەکەی (هرسی) کراو، لەلایەن سەرۆك وەزیرانەوە بە گەرمی پێشوازی لێ کراو ناوبراو سوپاس و پێزانینی خۆی ئاراستەی (هرسی) کردو، سەرسوڕمانی خۆی نەشاردەوە سەبارەت بە ئازایەتی (هرسی) و هێرشەکانی لەدژی پێغەمبەری ئیسلام.

نموونە لەم بارەوە زۆرەو، ئاماژە کردنمان بەوە، بۆ ئەوەیە هەتا موسڵمانان بزانن کە گرنگترین هۆکار بۆ دەست درێژی کردنە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) پشتیوانی دەوڵەتانی ڕۆژئاوایە لەو ڕووەوەو، ئەمە لەکاتێکدایە کە ڕۆژئاواییەکان بانگەشەی ئازادی بیروڕا دەکەن و هەمان کات ئامادەنین ڕێگە بە ئازادی بیروڕایەك بدەن کە بەرژەوەندی خۆیان و هاوپەیمانەکانیان بخاتە مەترسیەوە،بۆ نموونە هەر کەسێك بیەوێت لایەنە شاراوەکانی هۆلۆکوستی جوولەکەکان ئاشکرا بکات ئەوا بە شمشێر وەڵامی دەدەنەوە، دەتوانین بڵێین کە (حرية التعبير والنشر) تەنها بۆ لێدانی ئوممەتی ئیسلامییە و هیچی دی.!

## پاڵنەری ئابووری:

ئەم پاڵنەرە زیاتر لەلای گرووپە دووڕوو و هەڵگەڕاوەکان هەیە، ئەو کەسانەی کە ئاواتیان ڕازی کردنی ڕۆژئاواو کۆکردنەوەی سەروەت و سامانەو، سەرئەنجام بەو هۆیەوە هەر خۆیان گاڵتە بە ئاینەکەی خۆیان دەکەن، وەك: تەها حسێن ،سەلمان ڕوشدی ...هتد ئەمانە ئاواتیان بەدەستهێنانی دەسکەوت و پارەیە.

هەروەها کۆمەڵێکیش هەوڵ دەدەن بەم شێوازە پشتیوانی دارایی قەوارەی زایۆنی بۆ خۆیان وە دەست بخەن.

هەمان کات کەنیسەو قەشەکان لەکاتی هەڵبژاردندا پەنای بۆ دەبەن، وە ئەمە پیشەی بەردەوامی ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەیە کە نافرۆشرێن، بەم ڕێگەیە ڕێژەی فرۆش زیاد دەکەن و هەمان کات پاداشتیش دەکرێن، وە ئەو کاندیدانەی کە پێویستیان بەپارەی کاتی بانگەشەی هەڵبژاردنەو خۆیان لەدەستیان دا نیە، هەوڵ دەدەن بەم شێوازە وە دەستی بخەن ، هەروەها سەرجەم ئەو کەناڵە فاشیلانەش کە توانای ئەوەیان نیە بەرنامە پێشکەش بکەن بەردەوام لە هەوڵی بەخشینەوەی تۆمەت و بوختاندان لەدژی ئیسلام و پێغەمبەرە ئازیزەکەی (ﷺ).

## جیهاد لەڕێی خوادا:

گومانی تێدا نیە کە ڕۆژئاواییەکان ئاگاداری سەرجەم ئەو ئایەت و فەرموودانەن کە باسی جیهادو تێکۆشان دەکەن و موسڵمانان بۆ جەنگ کردنی بێ باوەڕانی جەنگی (حربي) هان دەدەن، ڕۆژئاواییەکان بەردەوام سەرقاڵی ئەنجا دانی توێژینەوەن سەبارەت بە واتاو مەغزاو کرۆك ومەبەستی جیهادکردن لەئیسلام دا،هەروەها کردەوە (استشهاد) یەکان دەکەنە بیانوو بۆ بە توندڕەو ناوبردنی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، هەروەك لە سەدەی چواردەی زاینی دا ئیمپراتۆری بێزەنتی (ئیمانوێل) ی دووەم سەبارەت بە ئیسلام هاتە گۆو وتی: پێم بڵێن موحەممەد (ﷺ) چ شتێکی تازەی هێناوە، ئەو تەنها کەسێکی شەڕانی و خوێن مژەو هەمان کات بە زەبری شمشێر خەڵك بۆ ئاینەکەی بانگ دەکات ! شیاوی باسە لەو کاتەدا پاپاش وەستا بوو، پشتگیری قسەکانی ئیمپراتۆری دەکردو ڕایگەیاند ئایەتی ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ﴾ لە کاتێدا دابەزیوە کە موحەممەد بێ دەستەڵات بووەو لەژێر هەڕەشەدا ژیاوە !

## کێبەرکێی شارستانی:

بێ گومان خوای پەروەردگار پێغەمبەرەکەی خۆی (ﷺ) بەکۆمەڵێك یاساو ڕژێمی ڕامیاری و فیکری گشتگیرەوە ڕەوانە کرد کە کێ بەرکێی توندی ڕۆژئاوا دەکەن، بە هەمان شێوە لەڕووی ڕێکخستن و کارگێڕی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانەوە، لێرەوە ڕۆژئاوا گەشتووەتە ئەو بڕوایەی ئیسلام تەنها بەرنامەیە کە گرنگی بە هەموو بوارەکان دابێت و ڕکابەرێکی زۆر ترسناکی ڕۆژئاواییەکانەو،ئەوەش زیاتر هاندەریانە بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام و تەوژمە ئیسلامیەکان وەك جۆرج بۆش ڕایگەیاند: ئێمە جەنگ و کوشتاری کەسانێك دەکەین کە دەیانەوێت سەر لەنوێ هەیکەلی جیهان ڕێك بخەنەوەو کار بۆ دووبارە گەڕاندنەوەی خەلافەتی ئیسلامی دەکەن. !

## ٢- تێڕوانینی هەڵە:

لە پاڵنەرە گرنگەکانی دەست درێژی کردنە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەیە کە هەندێك لە ڕۆژئاواییەکان بە هەڵە لە ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) گەیشتوون و لەو بارەوە گومڕا کراون، ئیدی با ئەوە بووەستێت کە لە بیروبۆچوونی زۆرێك لە کۆمەڵگا بێباوەڕەکان دا ڕق بوون لە ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) چەسپێنراوە.

ئێمە لە ڕووانگەی قورئانەوە ئەو ڕاستیە دەزانین و زیاتر ئەحبارو ڕوهبانەکانن کە خەڵکی لەو ڕووەوە گومڕا دەکەن، چونکە ئەوان وەك نەوەکانی خۆیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەناسن ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾﴾ البقرة:١٤٦.

واتە: ئەوانەی کتێبمان پێبەخشیون،پێغەمبەر (ﷺ) دەناسن هەروەك چۆن نەوەکانی خۆیان دەناسن، بێگومان دەستەیەك لەوان ئەو ڕاستیە دەشارنەوە، لەکاتێکدا دەشزانن (محمد ﷺ) فروستادەی خوایە.

هەروەها دەفەرموویت: ﴿وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾﴾ البقرة: ٨٩.

واتە: کاتێك لەلایەن خواوە کتێبێك (قورئان) هات بۆیان، کە ئەو کتێبانەی ئەوانیش پەسەند دەکات و بەڕاستیان دەزانێت، ئەوان پێشتر داوای سەرکەوتن و زاڵ بوونیان دەکرد، بەسەر ئەوانەدا کە بێ باوەڕ بوون بەخوا، بەهۆی شوێنکەوتنیان بۆ پێغەمبەر (ﷺ)،کەچی کاتێك ئەو پێغەمبەرەیان بۆ هات کە دەشیان ناسی،بڕوایان پێ نەکرد،کەواتە با نەفرینی خوا لەسەر کافران بێت.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ ...﴾ الاعراف: ١٥٧.

واتە: ئەوانەی کە شوێنی ئەم (محمد ﷺ)ە ، پێغەمبەرە هەواڵدەرە نەخوێندەوارە دەکەون ئەوەی کە (گاورو جوولەکە، ناونیشانیان) دەستیان دەکەوێت نووسراوە لای ئەوان لە تەورات دا و ئینجیل دا...

## دەتوانین بڵێین ئەحبارو ڕوهبانەکان بە ئەنقەست و لەبەر چەند هۆیەك هەوڵی ناشیرین کردنی پێغەمبەر دەدەن، لەوانەش:

### ئێرەیی:

وەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم ...﴾ البقرة: ١٠٩.

واتە: زۆرێك لە خاوەن کتێبەکان ئاواتە خوازن لەبەر حەسوودی و ناپاکی خۆیان ئەگەر بۆیان بکرێت بتانگێڕنەوە ڕیزی بێ باوەڕان و...

## خۆش ویستنی سەروەت و سامانی دونیا:

هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَشۡتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلًا ...﴾ البقرة: ١٧٤.

واتە: بێگومان ئەوانەی نیگای خوا دەشارنەوە کە لە کتێبەکانی دا ڕەوانەی کردوون (تەورات، ئینجیل، قورئان) و بەو شاردنەوەیە نرخێکی کەم بەدەست دەهێنن...

هەروەك کۆمەڵە کەسانێکی تریش ڕۆڵی گەورەیان هەیە لە گومڕا کردنی خەڵك دا سەبارەت بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەوانیش کەسانێکن کە هیچ شتێك سەبارەت بە ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) نازانن و، تەنها ئەوەندە شارەزان کە بە هەڵە لە ڕاگەیاندن و زاری قەشەکانەوە پێیان گەیشتووەو ؟ ئیدی ئەوانیش بە شوێن ڕاستیەکان دا ناگەڕێن و سەر ئەنجام لەسەر ئەو بنەما هەڵەیە کە لە مێشکیان دا چەسپیوە، بانگەشە لەدژی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەکەن و خەڵك گومڕا دەکەن.

## چەند هۆکارێك یارمەتی دەرن بۆ سوکایەتی کردن بە ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، گرنگترینیان ئەمانەن:

### ١- توێژینەوە ڕۆژهەلاتیەکان:

دوژمنانی ئیسلام بەردەوام و ئێستاشی لەگەڵدا بێت، هەوڵیان داوە لەڕێی ئەم توێژینەوانەوە بەشێوەیەکی ناشیرین و چەواشەکاریانە ئیسلام وێنا بکەن، ڕۆژئاوا بەردەوام ئامادەی هەموو جۆرە هاوکارییەکە هەتا ئەم توێژینەوانە بەو شێوەیە بن کە خۆی دەیەوێت بە ئاڕاستەی ناشیرین کردنی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ).

ئیدوارد سەعید یەکێکە لە ڕۆژهەلات ناسەکان و لە یەکێك لە دانراوەکانی دا دەڵێت: ناسینی ئیسلام لەلایەن ڕۆژئاواییەکانەوە لەم قۆناغەدا، تەنها بۆ ئەوەیە کە زاڵ ببن

بەسەر ئیسلام داو بەپێچەوانەوە ئەوان حەز ناکەن بە هیچ شێوازێك لە ئیسلام تێ بگەن و، دەیانەوێت بەناشیرین کردنی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ڕای گشتی بجووڵێنن هەتا بەسەر ئیسلام دا زاڵ ببن، کە لەم ڕووەشەوە دامەزراوەکانی هێزر و زانیاری ڕۆژئاوا هاوکاریانن و بە هەمان شێوە دامەزراوە فەرمیە داگیر کەرەکانی ڕۆژئاوا لەو نێوەندەدا ڕۆڵی بەرچاویان هەیە.

## ٢- پرۆگرامەکانی خوێندن:

پرۆگرامەکانی خوێندن بەردەوام لەهەوڵی بەلاڕێ بردنی وەچەکانی ڕۆژئاوادان سەبارەت بە ئیسلام، ڕۆژئاواییەکان لە پرۆگرامی خوێندندا ژەهرێکی ئەوتۆیان لەدژی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ڕژاندووە.! ئیدی بەم شێوازەی هەر لە منداڵیەوە ڕقێك لە ناخی منداڵەکانیاندا لەدژی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەچێنن، بیرمان نەچێت کە ئەمەش دەرئەنجامی توێژینەوە ڕۆژهەلاّتیەکانە.

## ٣- لۆبی قەوارەی زایۆنی:

لۆبی قەوارەی زایۆنی لەو ڕووەوە ڕۆڵێکی کاریگەرو ترسناکی هەیە، هەموو توانایەکی مادی خۆی لەو پێناوەدا خستووەتە کار، تەنانەت توانیویەتی وێنەیەکی شێوێنراوی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) نیشانی ڕۆژئاواییەکان بدات، هەمان کات قەوارەی زایۆنی بەردەوام لەڕێی ڕاگەیاندنی خۆیەوە دەیەوێت ئەوە بەجیهان بلێت کە دەوڵەتی جوولەکە دەوڵەتێکی شارستانی و دیموکراسی بچووکە،بەڵام لەڕاستیدا گەورەترین هەڕەشەیە بۆ سەرجیهان بەگشتی و موسڵمانان بەتایبەتی.

هەروەك ئەندامێکی ئەنجوومەنی نوێنەرانی پێشووی ئەمریکی کە (بول فدلی)ـە ڕایگەیاند: لۆبی قەوارەی زایۆنی ڕۆڵێکی خراپ و کاریگەری هەیە لەشێواندنی ڕووی ڕاستەقینەی ئیسلام و موسڵمانان دا لەسەر ئاستی جیهانی ،ناوبراو لە درێژەی

وتەکانیدا دەڵێت: جولەکە هەوڵ دەدەن کە بەربەستێك لەنێوان تاکی ڕۆژئاوایی و ئاینی ئیسلام دا درووست بکەن، هەروەها هاوکاری سەرجەم ئەو دامەزراوانە دەکەن کە کاریان ناشیرین کردنی وێنەی ئیسلام و موسڵمانانە لەناخی هاوڵاتیانی ڕۆژئاوادا، بەتایبەت هەوڵ دەدەن ئەمە لەناخی ئەمریکیەکاندا بچێنن، گرنگترینی ئەو هۆکارانەی کە لەم ڕووەوە کاریگەرییان هەیە وەك:

* ڕۆژئاواییەکان چاك لەو ڕاستیە گەیشتوون کە ئیسلام گەورەترین مەترسیە بۆ سەر بەرژەوەندییەکانیان، هەمان کات لە ئەنجامی ئەو جەنگە جیهانیەش دەترسن کە لە داهاتوودا خۆیان هەڵی دەگیرسێنن بەلأم بە سەرکەوتنی موسڵمانان کۆتایی دێت.

*ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا هەوڵ دەدات بەو شێوازە وێنای بزووتنەوە ئیسلامیە جیهادیەکان بکات کە دژی مرۆڤایەتی و دیموکراسین، بەردەوام بەگرووپی تیرۆریستی ناویان دەبەن، ئەمە گرنگترینی ئەو ڕاستیانەن کە لەلایەن (بول فندلی) ئەندامی پێشووی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمریکیەوە بۆ ڕای گشتی جیهانی ئیسلامی ئاشکرا کران .

# ئەو سوکایەتیانەی کە لەم سەردەمەدا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکرێن

## خوێندنەوەیەکی شیکاریانە بۆ ئەو زنجیرە دەست درێژیانەی دەکرێنە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)

سوننەتی پەروەردگارە و پێویستە بەردەوام پێکدادان و ڕووبەڕوو بوونەوە لەنێوان (حەق و باتڵ، باوەڕ و کوفردا) هەبێت، وەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ﴾ الحج: ٤٠.

واتە: خۆ ئەگەر خوا خەڵکی نەدابایە بە گژ یەکداو حەق دژی بەتاڵ نەوەستێت، هەرچی شوێنی خوا پەرستی جوولەکەو گاور هەیە لە خەڵوەتگاو کڵێساو کەنیسە، هەروەها مزگەوتەکانیش کە ناوی خوایان زۆر تیا دەبرێت، هەمووی کاول دەکرێن، سوێند بێت ! خوا ئەو کەسە سەر دەخات کە پشتگیری ئاین و بەرنامەکەی دەکات و هەوڵی سەرخستنی دەدات! بەڕاستی خوا زۆر بەهێزو بالادەستە.

بۆ بەردەوامی دان بە ژیان ئەم پێکدادانەی نێوان هێزی ئاشتی و هێزی شەڕ زۆر پێویستە،تەنانەت پێغەمبەرانیش کە ترۆپك و پێشەوای بانگەوازی خوایین،لەم پێکدادانە بێ بەش نەبوون،بەپێچەوانەوە هەموو پێغەمبەران لەم ڕووەوە قوربانی زۆر گەورەیان داوەو زۆرترین کارەساتیان ڕووبەڕوو بووەتەوە، تەنانەت کار گەیشتووەتە ئەو ڕادەیەی کەبێ باوەڕان دەستیان چووەتە خوێنی پێغەمبەران و شەهیدیان کردوون، وەك پەروەردگار ئاماژە بەم سیفەتە نەگریسەی بەنی ئیسرائیل دەکات و

دەفـــەرمووێت: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِآيَاتِ اللَّهِ وَقَتْلِهِمُ الْأَنبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌ ۚ بَلْ طَبَعَ اللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥٥﴾﴾ النساء: ١٥٥.

واتە: ئینجا بەهۆی پەیمان شکاندنیان و بێباوەڕییان بە ئایەتەکانی خواو ، بەناڕەوا شەهید کردنی پێغەمبەران لەلایەن ئەوانەوەو ئەو قسەیەشیان کە دەڵێن: دڵی ئێمە داخراوەو بەرگی پێوەیە (مەبەستیان ئەوەیە کە ئامادە نین گوێ بۆ هیچ ڕاستیەك بگرن، خوا خەشمی لێ گرتن و نەفرینی لێ کردن) نا بەو جۆرە نیە کە ئەوان دەیڵێن ،بەڵکو خوا مۆری ناوە بەسەر دڵ و دەروونیان دا بەهۆی بێ باوەڕ بوونیانەوە، جا هەر بۆیە کەمێکیان نەبێت باوەڕ ناهێنن.

## دیاردەی سوکایەتی کردن بە پێغەمبەران و پیاوچاکان مێژوویەکی دێرینی هەیە:

ئیبلیس داهێنەری دوژمنایەتی کردنی هێزی حەق و ڕاستیە،لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَقُلْنَا يَا آدَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰ ﴿١١٧﴾﴾ طه:١١٧.

پاشان شوێنکەوتووەکانی ئیبلیس پەرەیان دا بەم سوکایەتی کردنانەو چەندین ڕێگایان بۆ ئازاردانی پێغەمبەران داهێنا، سەرەتا لەچاو هەڵتەکاندن و توانج و قسە پێ وتن و ڕووبەڕوو بوونەوەوە دەستی پێ کرد، سەرئەنجام کار گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە شەهید کردنی پێغەبەران بوو بە شتێکی زۆر سادەو ئاسایی، بەتایبەتی لەناو بەنی ئیسرائیل دا کە بەپێی هەندێك سەرچاوە زیاتر لە هەزار و دووسەد پێغەمبەریان شەهید کردووە!

وەك دەزانین پێغەمبەری خۆشمان (ﷺ) لەم ئازاردانە بێ بەش نەبووە، هەر ڕۆژەی بەجۆرێك ئازاریان دەداو بە ساحیرو فاڵچی و شێت ناویان دەبرد، زۆرجار لە کەعبەدا نوێژی دەکرد کاتێك دەچووە سوجدەوە بێ باوەڕان پاشەڕۆی ئاژەڵیان

دەکرد بە سەری دا، یاخود عەباکەیان ئەوەندە بە توندی ڕادەکێشا تا ئەو ئەندازەیەی خەریك بوو بخنکێت، زۆرجار ئەوەندەیان لێ دەدا بۆ ماوەیەکی زۆر لەهۆشی خۆی دەچوو یاخود بەردەباران دەکرا ! وەك لە (طائیف) دووچاری هات، ئیدی با ئەو هەموو ئازارو چەرمەسەریانە بووەستێت کە لە شەڕی ئوحود دووچاری هات. ! ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە (ﷺ) تەنها ئەوەندەی دەفەرموو: گەلێك چۆن ڕزگاری دەبێت کە بەو شێوازە مامەڵە لەگەڵ پێغەمبەری خۆیاندا بکەن.. ! بەڵێ بەدرێژایی شەست وسێ ساڵ پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوام لەگەڵ ئازاردا ژیا هەتا کۆچی دوایی کردو بە خۆشەویستەکەی شاد بوویەوە.

بێ گومان ئازاردانی پێغەمبەران تەنها لەبەر ئەوە بووە، کە خەڵکیان بۆ لای خوای گەورە بانگ کردووەو داوای باوەڕ هێنانیان لێ کردوون ﴿وَمَا نَقَمُوا۟ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٨﴾﴾ البروج: ٨.

واتە: ئەم ڕق و داخەیان لەئیمانداران تەنها لەبەر ئەوە بوو، کە ئەوان باوەڕی بەتینیان دەهێنا بەخوای باڵادەستی شایستەی سوپاس و سوپاسگوزاری.

ئەمە کورتەیەك بوو بۆ ئاشنا بوونتان بەو سوکایەتیانەی کە لە دێر زەمان و لە ڕابردوودا بەرامبەر پێغەمبەران ئەنجام دراون.

## سوکایەتی کردنی سەردەم:

بە هەمان شێوە لەم سەردەمەشدا دوژمنان بەردەوامن لەسەر ڕێبازی نەگریسی پێشینەکانیان لەسوکایەتی کردن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بەڵام لەم سەردەمەدا دوژمنان لەڕووی هونەری ئەو سوکایەتی کردنانەوە نوێ گەری و داهێنانیان کردووەو، هۆکارو شێوازی ئەوتۆیان داهێناوە کە تەنانەت بەبیری شەیتانیش دا نایەت، هەرچی سوکایەتی کردنیشە دەکرێت بە دوو بەشەوە:

یەکەم: سوکایەتی کردن بەگوفتار.

دووەم: سوکایەتی کردن کردن بەکردار.

## یەکەم: سوکایەتی کردن بە گوفتار:

سوکایەتی کردن بە گوفتار چەند شێوازێك لە خۆ دەگرێت،وەك قسە پێ وتن وتوانج دان وگاڵتە پێکردن و...هتد

لەم ڕووەوە نموونەو ڕووداو زۆرە، بەڵام ئێمە لێرەدا هەوڵ دەدەین تەنها ئاماژە بە چەند نموونەیەك بکەین، شیاوی باسە زۆربەی ئەو بێ ئەدەبیانەی کە بەرامبەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەنجام دەدرێن ڕاستەوخۆ لەلایەن گەورە بەرپرسانی ڕۆژئاواوە دەورووژێنرێن، هەموو ئەم دەست درێژیانە مەبەست و مەرامی تایبەتیان لەپشتەوەیە، لەڕووی ڕاگەیاندنەوە ئاماژە بە چەند نموونەیەکی دیاری کراو دەکەین، هەمان کات ئاماژە بە چەند کەسایەتیەکی دیاری کراویش دەکەین کە لە دەسەڵاتدارانی ڕۆژئاواوە زۆر نزیکن.

## ڕوانگەی یەکەم:

ڕۆژنامەی (هیوستن برس)ی ئەمریکی ڕۆژنامەیەکی هەفتانەیەو لەویلایەتی تەکساس دەرئەچێت، شیاوی باسە ئەم ڕۆژنامەیە ڕیکلامێکی بەدرەوشتانەی بڵاوکردەوە سەبارەت بە نمایش کردنی فیلیمێك بەناونیشانی (الحياة الجنسية للنبي محمد).!!! لە پەرچەکرداریان دا موسڵمانانی تەکساس ناڕەزایی و تووڕەیی خۆیان نیشان داو داوایان کرد کە نمایش کردنی ئەو فیلمە قەدەغە بکرێت، بەڵام ئەوان لە نمایش کردنی فیلمەکە بەردەوام بوون و سەرباری ئەوەش داوایان لە پۆلیس کرد کە موسڵمانەکان بڵاوە پێ بکات ، سەرئەنجام هیچ لێپێچینەوەیەکیش لەو ڕووەوە ئەنجام نەدرا.

هەروەها لەو ڕووداوانەی کە شایانی باس کردنن، ڕووداوی هێرش کردنە سەر ڕێکخراوی (بني بريث) ی زایۆنییە، لەساڵی (١٩٧٧) دا، شیاوی باسە هۆکاری هێرش کردنە سەر ئەم ڕێکخراوە لەلایەن موسڵمانانەوە ئەوە بوو، کە موسڵمانان داوایان

دەکرد فیلمی سینەمایی (محمد رسول الله) قەدەغە بکرێت، هەمان کات داوای ئەوەیان دەکرد کە بکوژانی (مالکوم إکس) ڕا دەستی یاسا بکرێن، ناوبراو بانگخوازێکی بەناوبانگ و ناسراو بوو، لەسەر دەستی دا دەیان کەس موسڵمان بوون ، چالاکی و کاریگەری ئەم بانگخوازە ئەمریکیە ترسی خستە دڵی دوژمنانی ئیسلامەوە، سەرئەنجام لە (١٣ ی شەوالی١٣٨١ ) دا لە کاتێك دا کە لە زانکۆی نیۆرك کۆڕێکی بۆ ساز کرا بوو، لەناکاو لەلایەن سێ کەسەوە بە چەك هێرش کرایە سەری و شەهیدیان کردو حکومەتی ئەمریکیش بکوژەکانی پەنادا.

دەمانەوێت لەم نموونانەوە، ئەو ڕاستیە بە خوێنەرانی بەڕێز بڵێین کە سووکایەتی کردن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەڕۆژئاوادا کارێکی نوێ نیە، بەڵکو ئەوان لەو ڕووانگەوە نەخشەو پلانی تۆکمەیان هەیە، جار جار دەیورووژێنن و جار جاریش دەیشارنەوە.

هەروەها هەندێك لە ڕاگەیاندنە ڕۆژئاواییەکان بە ئەنقەست، نەخشەو پلانی ورد دادەڕێژن بۆ ناشیرین کردنی ئیسلام و موسڵمانان، لەم ڕووەشەوە جەنگی (ڕادیکاڵی) دەکەنە بیانوو، ئەمەش کارێکی نوێ نیە، لەساڵی (١٩٨٥) دا (برنارد بیفو) کە ناوبراو ڕاگەیاندکارێکی فەرەنسیەو، پێشکەشکاری بەرنامەی (ابوستروف)ە، یەکێك لە بەرنامەکانی خۆی تایبەت کرد بە قسەکردن لەسەر (قورئان و توندوتیژی) کە ناوبراو سێ میوانی بانگهێشتی بەرنامەکە کردبوو،بێ شەرمانەو ڕاستەوخۆ قورئان و توندو تیژییان پەیوەست کرد بە یەکەوە، ئەو ڕۆژنامە نووسە فەرەنسیە هەر لە سەرەتاوە دانی بەوەدا نا کە ئەو قورئانی نەخوێندووەتەوەو ڕایگەیاند: کە لەو بارەوە هیچ شارەزاییەکی نییە! هەمان کات چەندین جار بەبێ زانیاری ئەو شاهێدیەی داو ڕایگەیاند کە قورئان پەڕاوێکی توندو تیژە.

لەم سەردەمەشدا زۆر نووسەر هەن کە هەمان ڕێچکەیان گرتووەتە بەرو، بەکوێرانە باسی ئیسلام و قورئـان و پێغەمبـەر (ﷺ) دەکـەن، لەوانـەش نووسـەرو ڕاگەیانـدکارە سویدی و دانیمارکیەکانن.

هـەر لـەو کەسـانەش کـە سـنووریان بەزانـدووە لـەکاری ڕاگەیاندنـداو بەهۆیـەوە لـە ئیـسلام هەڵگەڕاونەتـەوە، نموونـەشمان (ایـان حرصـی)ــە نـاوبراو سـەبارەت بـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەڵێـت (بـەپێی پێوانـە ڕۆژئاواییـەکان موحەممـەد کەسـێکی سـنوور بـەزێن و سـتەمکارە. !). لەبەرامبـەر ئـەو سـووکایەتی کردنەشـدا کۆمـەڵێك موسـڵمانی هوڵەنـدا سـکاڵایان لـەدژی تۆمـار کـرد، بـەڵام سـکاڵاکان وەرنـەگیران و لـە بەرامبەردا داواکاری گشتی ڕایگەیاند: ئەو وتانە کار ناکاتە سەر ڕای گشتی کۆمەڵگـەی موسڵمانی هوڵەنداو ناوبراو ئەوەشی وت کە مـافی موسـڵمانان وەك کۆمـەڵێکی کەمینـە پێشێل کراوە. پاشان کتێبێکی (أيان حرصي) چاپ کـرا بەناونیـشانی (قفـص العـذاری) ناوبراو لەو کتێبەدا پێداگری لەسەر دەرکردنی فیلمێك دەکات لەسەر ژیانی پێغەمبـەری خوا (ﷺ)، هاوشێوەی فیلمی (حیـاة بـراین)، وە کەسێکیـشی دەسـت نیـشان کردبـوو هەتا لە فیلمەکەدا تەمسیلی کەسایەتی پێغەمبەر (ﷺ) بکات، نـاوبراو ئامـانجی ئـەوە بوو کـە لـەو فیلمـەدا کۆمـەڵێك ڕووداو و بوختـان بوروژێنێـت کـە بـەلای موسـڵمانانەوە هێڵی سوورن.

هەروەها لە ٢٣ی نۆڤەمبەری ساڵی ٢٠٠٥ دا هەمان نووسـەر لـە چـاوپێکەوتنێکی دا لەگەڵ ڕۆژنامەی (صابفو) ی دانیمارکی دا، سەبارەت بە وێنە کاریکاتێریەکان باسـێکی وورووژاندوو ناوبراو دەربـارەی پـیرۆزی قورئـان لـەلای موسـڵمانان ڕایگەیانـد: ماوەیـەك پێش ئێستا لەگەڵ کۆمەڵێك ڕۆژنامەنووسی عەرەب دا کۆبوومەوە، پاشان قورئانێکم لە جانتاکەم دا دەرهێناو فـڕێم دایـە سـەر زەوی، دواتـر کـچێکی تـورکی کـە موحەجەبـەو پۆشتە نەبوو و لە عەلمانی دەچوو پێی وتم: داوات لێ ئەکەم کە ئەو قورئانە بخەیتـەوە ناو جانتاکەت. ! منیش پێم وت: ئەمە نوسخەی خۆمەو ئازادم هەرچییەکی پـێ بکـەم،

ئەویش لە وەڵامدا ڕایگەیاند: تۆ بۆت نییە سووکایەتی بە قورئانەکەمان بکەیت؟چونکە تەنانەت بەرگ و کاغەزو مەرەکەبەکەیشی بەلای موسڵمانانەوە پیرۆزە.!

هەر سەبارەت بە سوکایەتی کردنی بێ باوەڕان بە قورئانی پیرۆز پێمان خۆشە ئەم ڕووداوە ڕاستەقینەیەتان بۆ بگێڕینەوە: لەبنکەیەکی سەربازی تورکیادا ئاهەنگێك سازکرا ،کە نزیکەی سی جەنەڕاڵی تورکی و سی جەنەڕاڵی ئەمریکی و سی جەنەڕاڵی قەوارەی زایۆنی تێیدا بەشدار بوون،ئافرەتانی سەماکەریش بە گۆرانی و سەماو نا شەرعی ئاهەنگەکەیان بۆ گەرم کردبوون! لەو ساتەدا جەنەڕاڵێکی عەلمانی تورکی داوا لە نەقیبێکی لای خۆی دەکات کە قورئانێکی بۆ بهێنێت! کاتێك قورئانەکەی بۆ دەهێنێت،جەنەڕاڵەکە پێی دەڵێت:بیخوێنەرەوە،ئەویش هەندێك قورئانیان بۆ دەخوێنێتەوە،پاشان دەڵێت : بۆشمان مانا بکە،نەقیبەکە دەڵێت: نازانم مانای بکەم ،پاشان جەنەڕاڵە تورکە عەلمانیەکە بەتوندی قورئانەکە ی لێ وەردەگرێت و دەیدڕێنێت وفڕێی دەداتە ژێر پێی ئافرەتە سەماکەرە بەدڕەوشتەکان و گێلانە دێتە گۆو دەڵێت : کوا ئەو خوایەی کە دەڵێت قورئان دەپارێزم ،با بێت بیپارێزێت! ؟پاشان نەقیبەکە لە ترسانا ڕادەکاتە دەرەوەو بنکەکە جێ دەهێڵێت؟چونکە دەزانێت کە دەقەومێت و پەروەردگار تۆڵە لەم بەدڕەوشتانە دەکاتەوەولەسزای خوا ڕزگار نابن! نەقیبەکە بەهۆی ئەو باوەڕەوە کە لە دڵیدا هەبوو بەردەوام بەدەم ڕاکردنەوە لە بەر خۆیەوە دەیگوت: خوا غەزەبمان لێ دەگرێت! ؟ئەوەندەی نەخایاند بنکە سەربازیەکە بەهەموو جەنەڕاڵ و میوانە بێ شەرمەکانیەوە کەنزیکەی سێ هەزار کەسی تێدابوون، نغرۆبوو !ئیدی نە کلینتۆن و نە بۆشی درۆزنی پیلاو خۆرو نە شارۆن و ئەتا تورکەکان نەیان توانی بە هاواریانەوە بێن! ؟ڕۆژنامە تورکیەکان لەسەر زاری ئەم نەقیبە باوەڕدارەوە بۆ ڕۆژی دواتر ڕاستی ڕووداوەکەیان گێڕایەوە،پەروەردگار ئەم نەقیبەی ڕزگار کرد هەتا ئەم هەواڵە بەجیهان بدات،شیاوی باسە ئەم زەمین لەرزەیە تەنها پەنجا چرکەی خایاند و تیایدا تورکیای ڕووبەڕووی گەورەترین قەیرانی مادی و مرۆیی کردەوە.؟!!

## ڕووانگەی دووەم:

ئەمانیش لە چەند سەرکردەو پێشەوایەکی ئاینی پێك هاتوون، کە گەورەترین سووکایەتییان بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ) ئەنجام داوە، بەتایبەت پیاوە ئاینیەکانی نەسارا و بەرپرسە گەورە ئاینیەکانیان جا چ کاسۆلیك بن یان پرۆتستانت.

سەبارەت بە کاسۆلیکەکان ئەوە بەسە کە سەرکردەکەیان ئامادە نەبوو داوای لێبوردن لەموسڵمانان بکات، بەڵکو لەوە نیگەران بوو کە موسڵمانەکان لە وتەکانی حاڵی نەبوون، جا ئەگەر سەرۆکەکەیان لە کۆڕێکی فەرمیدا وتەکانی ئیمپراتۆری بێزەنتی دووبارە بکاتەوەو لە وتەکانیدا سووکایەتی بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بکات و پارێز نەکات. ! ئیدی دەبێت هەڵوێستی ئەو کەسانە چۆن بێت بەرامبەر بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) کە پلەو لێپرسراویەتیان لەو کەمترەو وتەکانیشیان لەو بێ نرخترە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم (بندیکت)ـە وتەی تری هەیە لەدژی ئیسلام ، بەڵام هەندێك دەڵێن ئەم پیاوە وتەکانی هی خۆی نییەو بەڵکو وتەی کەسانی ترە کە نەقڵیان دەکات، وەك ئەوەی بیانەوێت بێ تاوان دەری بکەن.

ئیمامی (قاضي عياض) دەفەرمووێت: ئەو کەسە ئەگەر بەوە تۆمەتبار بکرێت کە خۆی ئەو وتانەی درووست کردووەو داویەتیە پاڵ کەسێکی تر، یان ئەوە کارو پیشەی بووە، یان وتەکانی پەسەند کردووە، یان پێی خۆشبووەو بێ بایەخ سەیری کردووە، یان بە شوێنیان دا بگەڕێت و کۆیان بکاتەوە، یان ئەو شیعرانە بگێڕێتەوە کە سووکایەتییان بە پێغەمبەر (ﷺ) پێ کراوەو جنێویان پێ دراوە، ئەوە بێ گومان حوکمی جنێو دەرەکەو نەقڵ کەرەکە یەکسانەو، وتەی گێڕەوەکەش بە هەند وەردەگیرێت و گوێ بەوە نادرێت کە وتەی خۆی نیە، جا هەروەك چۆن پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کوشتنی دوو جاریەکەی دا کە شیعرەکانی (إبن خصل) یان بەگۆرانی دەوتەوەو هەمان کات شیعری خۆشیان نەبوو.

سەبارەت بە (پرۆتستانت)ـەکانیش لەساڵی ١٤٢٣ی کۆچی دا لە ئەمریکادا قەشەکانیان حەملەیەکیان ڕێکخست بۆ تانەدان لە پێغەمبەر (ﷺ) و ناشیرین کردنی سیرەتی موبارەکی،هەروەك لەئێستادا چەندین دامەزراوەی ئابوری و ئیعلامی لە ڕۆژئاوادا بونیان هەیە کەتەنها کاریان تانە دانە لە ئیسلام و پێغەمبەرە ئازیزەکەی (ﷺ) ! زۆربەی ئەو دامەزراوانەش ڕاستەوخۆ لەلایەن پیاوانی ئاینیەوە سەرپەرشتی دەکرێن لەو کەسایەتیانەش وەك:

## ١- جیری فالویل:

(جیری فالویل) ناوبراو قەشەیەکی بەناوبانگەو دانیشتوی شاری (لیتشرج)ە لەناوچەی فەرجینیای وویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا،شیاوی باسە جیری فالویل هەفتانە پێشکەش کاری بەرنامەیەکی ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنیەو پەخش ومەوداکەی بەزیاتر لە دە ملیۆن ماڵ دەگات! هەروەك ناوبراو خاوەنی زانکۆیەکە بە ناوی زانکۆی سەربەستی،ئەم قەشەیە بەوە ناسراوە کە بەردەوام لە ڕێی دامەزراوە گەورەکانی ڕاگەیاندنی ئەمریکیەوە هێرش دەکاتە سەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) ! هەروەها نووسەری کتێبی (معرکة الهرمجدون)ە کە لە سەرەتای کتێبەکەی دا ژیان نامەیەکی لە درۆ درووست کراوی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) داتاشیوە.!

شایانی باسە لە ١٦ ئۆکتۆبەری ٢٠٠٢دا حزبەکەی بوش هەستا بەڕێز لێنانی ئەم قەشەیە (جیری فالویل) لەبەر پاڵپشتی کردن و لایەنگیری کردنی بۆ بەرەی چەپڕەوی پارێزکارو پارتی کۆماری، جا ئەو لەناو چووە (جیری فالویل) دەڵێت (بەبۆچوونی خۆم مووساو مەسیح نموونەی خۆشەویستیان پێشکەش کرد، بەڵام موحەممەد پێچەوانەی ئەوانی پێشکەشی مرۆڤایەتی کرد).!

هەروەها لەچاوپێکەوتنێکی لەگەڵ بەرنامەی (٦٠ خولەك) دا دەڵێت: (من پێم وایە موحەممەد تیرۆریست بووە.! ئەوەندەشم بەسە بۆ شارەزا بوون لە موحەممەد، کە لە

موسڵمانان و غەیری ئەوانیشەوە خوێندوومەتەوە کە موحەممەد پیاوێکی توندو تیژو پیاوی جەنگ بووە).

ئەوەش مانای ئەو جەنگە دەگەیەنێت کە دژی موسڵمانان بەناوی تیرۆرەوە ئەیکەن، جا نازانین (جیری فالویل) چی لە موسڵمانان خوێندووەتەوە، ئایا ئایەتی (وما أرسلناك الا رحمة للعالمين) ی خوێندووەتەوە.! مایەی سەرسوڕمانە کە ئەم قەشەیە یەکێکە لە بەهێزترین پاڵپشتەکانی قەوارەی زایۆنی ، شیاوی باسە قەوارەی زایۆنی فرۆکەیەکی جۆری (ویند ستریم) یان بەدیاری دا بە (جیری فالویل) کە نرخەکەی لەنێوان (٢,٥ — ٣,٥) ملیۆن دۆلاردایە، ناوبراو بە دڵسۆزترین قەشە دادەنرێت بۆ قەوارەی زایۆنی و ڕایدەگەیەنێت کە هاوکاری کردنی ئیسرائیل لەلایەن ئەمریکاوە تەنها لەبەرژەوەندی قەوارەی زایۆنی دا نیە، بەڵکو هاوکاری کردنی ئیسرائیل واتای پارێزگاری کردن و مانەوەی ئەمریکا دەگەیەنێت.

هەروەهادەڵێت: ئێمە حەفتا ملیۆن کەسمان لەگەڵدایە، هیچ شتێکیش نیە تووڕەیی گەلی مەسیحی بڕژێنێت بەسەر ئەم حکومەتەدا کە دەست بەرداری ئیسرائیل بێت، یان بەرهەڵستکاری کێشە حەیەویەکانی بێت.

لە ١٤/٤/ ١٩٩٨دا ڕۆژنامەی (یو إس إیە توادی) ئەمریکی بابەتێکی (جیری فالویل) ی بڵاوکردەوە کە تیایدا ناوبراو ڕەخنەی لەئیدارەی سەرۆکی دیموکراتەکان (بیل کلینتۆن) گرتبوو، بەوەی کە ئیدارەی ئەمریکی فشاری خستووەتە سەر ئیسرائیل بۆ ئەوەی نەخشەی ئاشتی ئەمریکی قبووڵ بکات، لە بابەتەکەی دا دەڵێت: ئەو فشارەی ئەمریکا دەیخاتە سەر ئیسرائیل ئەبێت هەموو ئەو کەسانە نیگەران بکات کە باوەڕیان بە (بەڵێنی ئیبراهیم) هەیە سەبارەت بە زەوی ئیسرائیل.

ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ باوەڕی (الانجیلیکانیین) کە پێیان وایە خوای گەورە بەڵێنی بە ئیبراهیم داوە بەوەی کە زەوی ئیسرائیل بگەڕێنێتەوە بۆ جوولەکە.

جا سەرنجی (جیری فالویل) بدەن چۆن بکوژانی پێغەمبەران بەرز ڕائەگرێت و تانە لە (رحمة للعالمين)ەکەی ئێمەش دەدات، جا باس و خواسی ئەم کافرە لە پێشینانی خۆی خراپترو شەڕترە ﴿فَلَمَّآ أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِالَّذِى هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِى كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًۢا بِٱلْأَمْسِ ۖ إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِينَ ﴿١٩﴾﴾ القصص: ١٩.

بێ گومان ئەم ئایەتە باسی ڕووداوێك دەکات پێش ئەوەی مووسا ببێت بە پێغەمبەر ڕووی داوە بەڵام وتەکەی ئەو ،هاوشێوەی وتەکەی فیرعەونە ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِىٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِى ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٦﴾﴾ الغافر: ٢٦. کە بێ گومان ئەمەش وتە گەلێکی زۆر خراپە ﴿وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوْمَهُۥ لِيُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَيَذَرَكَ ...﴾ الاعراف: ١٢٧.

## ٢- پات ڕۆبەر تسۆن:

قەشە (پات ڕۆبەر تسۆن)یش نمونەیەکی دیکەیە ، ناوبراو یەکێك بوو لە یاریدەدەرانی جۆرج بۆش و کاریگەری زۆری هەبوو هەتا بۆش لە هەڵبژاردنەکاندا سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، هەر ئەم قەشەیە بوو کە بەرەی چەپڕەوی نەسرانی بەڕێوە ئەبرد کە لایەنگری بۆشی ئەکرد! هەمان کات بۆشیش لە ڕادە بەدەر یارمەتی دەرو هاوکارێکی باشی ئەم قەشەیە بوو.

(پات ڕۆبەرتسۆن) لە بەرنامەی (hannity golmes) ی کەناڵی فۆکس نیوسی ئیخباری دا دەڵێت: من دەڵێم: ئەم قورئانە لەبیرو باوەڕی جوولەکەوە دزراوە، پاشان موحەممەد دەستی کردووە بە کوشتنی جوولەکەو گاورەکان لە مەدینەدا، من مەبەستمە بڵێم موحەممەد پیاوێکی بکوژو خوێن مژ بووە...!؟

هەروەها دەڵێت: پێم وایە تیرۆر بەرەیەکەو تەنها لەلای کۆمەڵێکی (توندڕەو) بوونی نییە، تەنانەت قورئانێك بکڕەو بیخوێنەرەوە دەبینیت کە توندو تیژییەکی زۆر بڵاوی

تێدایە؟ دواتر موسڵمانان داوایان لێ کرد سەبارەت بەو قسانەی کە لە دژی پێغەمبەرو ئیسلام و موسڵمانان کردوویەتی داوای لێ بوردن بکات، بەڵام ناوبراو نەك ئامادە نەبوو داوای لێ بوردن بکات و تەنانەت لەکتێبە نوێیەکەی دا کە ناوی (الاسم – the name)ە لەلاپەڕە (٧١) دا دەڵێت: ئیسلام تاکە کەسێك داینـاوە کـە نـاوی موحەممەدە، مرۆڤێکی پیاو کوژو جەنگاوەر بووە، لە بەرنامەکانی دا تەکنیکێکی تایبەتی داناوە بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام بە سەرباز، ئەگەر پێویستی بکردایە ئەوا توندو تیژی بەکار دەهێنا!

هەروەها دەڵێت: ئیسلام پێچەوانەی ئاینی مەسیحیە، لە بەرنامەکانیدا دەمارگیرییەکی قووڵ بەدی دەکرێت بەرامبەر خاوەن ئاینەکانی تر.

هەروەك سەبارەت بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڵێت: موحەممەد گەلەکەی خۆی هان دەدا بۆ کوشتنی موشریکەکان، پیاوێکە لە ڕادەبەدەر دەمارگیرو دزو چەتە بووە، ئەوەی کە بانگەشەی بۆ دەکات هەمووی فێڵ بووەو لە سەدا هەشتای قورئانی لە دەقەکانی گاورو جوولەکەوە نەقڵ کردووە، دواتر دەستی دایە کوشتنی جوولەکەکان.

جا ئەو وتانەی ناوبراو بەراورد بکەن لەگەڵ وتەی جوولەکەکان دا کە لە (تەلموود)دا هاتوون (مەسیح شوێنی بەرنامەیەك کەوتووە کە درۆ بووە...) وە هەر لە تەلمووددا دەڵێن (مەسیح ساحیرێکی بت پەرست بووە) و (یەسوعی ناسری لەناو دۆزەخدایە) و (یەسوع گومڕایە، چونکە ئیسرائیلی لەناو برد)، خوای گەورەش ڕاستی فەرمووە: ﴿كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٌ ۝٥٢ أَتَوَاصَوۡاْ بِهِۦۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ ۝٥٣﴾ الذاريات: ٥٢، ٥٣.

واتە: هەر بەو شێوەیە هیچ پێغەمبەرێك لەپێش ئەماندا نەهاتووە خوانەناسان پێیان نەگوتبێت جادووگەرە یان شێتە، سەیرە ئایا دەڵێی بەگوێی یەکدا خوێندوویانەو یەکتریان ڕاسپاردووە، نەخێر بەڵکو ئەوانە هەرخۆیان قەومێکی ستەمکارو سەرکەشن.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿...تَشَٰبَهَتۡ قُلُوبُهُمۡ...﴾ البقرە: ١١٨.

واتە:... ئەمانە دڵەکانیان چوون یەکەو لەیەك دەچێت بەڵام شێوازی دەربڕینیان جیاوازە...

بێ گومان ئەو تۆمەتانەی کە (پات ڕۆبەرتسۆن) درووستیان دەکات، بەشێکی زۆریانی لە پێشینانی پێش خۆی وەری گرتوون، کە قورئان زۆر بەجوانی بەرپەرچیان دەداتەوە: ﴿وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ٤٨﴾ العنكبوت: ٤٨.

واتە: تۆ ئەی (محمد ﷺ) پێش ناردنی ئەم قورئانە هیچ کتێبێکت نەخوێندووەتەوەو بەدەستی خۆیشت هیچ شتێکت نەنووسیوە! (چونکە نەخوێندەوار بوویت) خۆ ئەگەر شتێکی وات ئەنجام بدایە لەو کاتەدا نەفام و دەم بەتاڵەکان دنیایان پڕ دەکرد لەشك و گومان کە گوایە قورئان لە دانان و داڕشتنی تۆیە.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّهُمۡ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٞۗ لِّسَانُ ٱلَّذِي يُلۡحِدُونَ إِلَيۡهِ أَعۡجَمِيّٞ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيّٞ مُّبِينٌ ١٠٣﴾ النحل: ١٠٣.

واتە: سوێند بەخوا ئێمە بەڕاستی دەزانین بێ باوەڕان دەڵێن: ئەم قورئانە تەنها کەسێك فێری دەکات (بە مەرجێك) زمانی ئەو کەسەی ئەوان دەڵێن قورئان فێری موحەممەد دەکات زمانێکی بێگانەیەو عەرەبی و ڕەوان نیە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم قورئانە بەزمانی عەرەبی پاراو و ڕوون و ئاشکرا داڕێژراوە.

جا هەر ئەو خراپەکارانە بوون کە لە مەککەدا ئازاری موسڵمانانیان دەداو، لە مەدینەش دا شکێنەری پەیمان و بەڵێن بوون و هەوڵی شەهید کردنی پێغەمبەریشیان دەدا (ﷺ)،(پات ڕۆبەرتسۆن) خۆی گومڕایەو دەیەوێت خەڵکیش گومڕا بکات، لەبەر ئەوە گاورو جوولەکەکان دەکاتە ستەم لێکراو و قوربانی دەرو، لە بەرامبەردا بە دڕندەو پیاو کوژ ناوی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵان دەبات.

شایەنی باسە (پات ڕۆبەرتسۆن) قەشەیەکی بەناوبانگەو هەمان کات پشتگیری لە قەوارەی زایۆنی دەکات !؟ ناوبراو خاوەنی چەندین دامەزراوەیە لەبواری ڕاگەیاندن داو، پێشکەش کاری بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیە، کە بینەرەکانی لە دەیان ملیۆن کەس پێك دێن، هەروەها خاوەنی کەناڵێکی ئاسمانییە کە بە پەنجا زمان و لە نەووەد وڵات دا پەخشی خۆی دەکات، ئامانجی سەرەکی ئەم کەناڵە بە گاور کردنی سەرجەم گەلانی جیهانە، هەروەها ڕادیۆی (الشرق الاوسط) کە تایبەتە بە پەرەپێدانی بە گاور کردن لەجیهانی ئیسلامی داو، هەمان کات خاوەنی زانکۆیەکی ئسوولێشە بەناوی (ریجینت)، وەك پێشتر ئامازەمان پێدا ئەم قەشەیە بەوە ناسراوە کە بەردەوام هێرش دەکاتە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ).

هەروەك پێویستە ئامازە بەوە بکەین کە لە ٤ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٢دا کۆشکی سپی بڕیاری دا کە بڕی نیو ملیۆن دۆلاری ئەمریکی وەك هاوکاری ئاینی بداتە (پات ڕۆبەرتسۆن) شیاوی باسە ئەم قەشەیە یەکەم کەسێکی ئاینیە کە بەو بڕە پارە زۆرە لەلایەن کۆشکی سپییەوە هاوکاری بکرێت؟!

## ٣- جیری فاینز:

نموونەیەکی تری پیاوە ئاینیەکان (جیری فاینز)ە، ناوبراو سەرۆکی پێشووی کڵێسەی (مەعمەدانیە)ی باشوور بووە، شیاوی ئامازەیە چەندین جار بۆش وەسفی (جیری فاینز)ی کردووەو بەو کەسانەی ناو بردووە کە لەگەڵ ئاینەکەیان دا ڕاستگۆن!

(جیری فاینز) سەبارەت بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڵێت: موحەممەد نامۆیەو... دوانزە ژنی هێناوە کۆتاییەکەیان منالێکی نۆ ساڵان بووە....!

بەدڵنیاییەوە سەرتاپای ئەم قسانەی درۆو بوختانن، هەر کەس عەودالی حەق و ڕاستی بێت، چاك دەزانێت کە خێزانی یەکەمی پێغەمبەر (ﷺ) پانزە ساڵ لەخۆی گەورەتر بووە، کاتێکیش کە عائیشەی خواست هیچ کەس لەدژی ئەو کارەی

پێغەمبەر(ﷺ) نەوەستایەوە، تەنانەت دوو ڕووەکانیش هیچ پەرچە کردارێکیان نەبووە، کە بەردەوامیش بۆ بچووکترین بیانوو دەگەڕان هەتا پێغەمبەری (ﷺ) پێ لەکەدار بکەن، بەڵام دوو ڕووەکان لە (جیری فاینز) زۆر شارەزا تر بوون و بارودۆخ و خووی ئەو سەردەمەیان زانیوە، لەو سەردەمەو ئێستاشی لەگەڵدابێت کارێکی زۆر ئاسایی بووە کە کچ شوو بکات کاتێك لەڕووی جەستەوە بگاتە ڕیزی ئافرەتان بێ ئەوەی ڕەچاوی تەمەن بکرێت، ئێمە لێرەدا ناڵێین پێغەمبەر (ﷺ) عائیشەی لەنۆ ساڵیدا کردووەتە هاوسەری. ! چونکە زانایان لەم ڕووەوە بۆچوونیان جیاوازەو، هەمان کات ئەگەر وادابنێین کە پێغەمبەر (ﷺ) لە نۆ ساڵیدا عائیشەی کردووەتە هاوسەری (کە ڕاستەقینە بەو شێوەیەش نییە) ئەوا ئەمە پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بە کەش و هەوای ناوچەکەوە، بۆ نموونە ئەگەر دوو کچی تەمەن نۆ ساڵان بەنموونەوە وەربگرین یەکێکیان نیشتەجێی ناوچەی سارد بێت و ئەوی دیکەشیان نیشتەجێی ناوچە گەرمەکان بێت، ئەوا دەبینین ئەو کچەی لە ناوچە گەرمەکان دا دەژی لەڕووی پێگەیشتنی جەستەیی و ژیری و توانای ماڵداری و سێکسیشەوە گەلێك پێگەیشتووترو بەتواناترە، لەو کچە هاو تەمەنەی خۆی کە لە ناوچەساردەکان دا دەژی، ئەمە بەتاقی کردنەوە سەلمێنراوە کە مرۆڤی ناوچە گەرمەکان لە هەموو ڕوویەکەوە گەشەیان لەمرۆڤی ناوچە ساردەکان خێراترە.

بێ گومان ئەمە یەکێك بووە لەو چەکانەی کە دوژمنانی ئیسلام لەدژی پێغەمبەر (ﷺ) بەکاریان هێناوە، لەناو هەموو خێزانەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) تەنها باسی ئەوە دەکەن کە عائیشەی لەنۆ ساڵیدا کردووەتە هاوسەری خۆی، کەچی چاویان ئەو ڕاستیە نابینێت کە پێغەمبەر (ﷺ) سەردەمی لاوی خۆی لەگەڵ بێوەژنێکدا بردە سەر کە پانزە ساڵ لەخۆی گەورەتر بوو، ئەمە جگە لەوەی هۆکاری تایبەتی و کاری بانگەوازو پێغەمبەرایەتی هاندەربوون تا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو هەموو ئافرەتە بکاتە هاوسەری خۆی، ئافرەت هەبووە کەس ئامادە نەبووە بیخوازێت و منداڵی زۆریشی

هەبووە، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبەر ئەوەی سەرپەرشتیان بکات و بژێویان دابین بکات ئافرەتەکەی خواستووە، هەروەها هۆکاری ڕامیاری زۆرجار هاندەر بووە تا پێغەمبەر (ﷺ) ئافرەتێك بخوازێت ، بەهۆی خواستنی ئەو ئافرەتەوە هەموو هۆزەکە موسڵمان بوون، واتە دەتوانین بڵێین کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو خێزانەکانی تەنها لەبەر بەرژەوەندی ئیسلام و سەرخستنی بانگەوازەکەی خواستووە، ئەگەر لەژیانی هاوسەرداریدا پێغەمبەر (ﷺ) ئامانجی تێر کردنی ئارەزووەکانی خۆی بووایە (وەك دوژمنانی ئیسلام دەڵێن) ئەوا ئامادە نەدەبوو گەنجی خۆی لەگەڵ بێوەژنێك دا بەسەر ببات کە پانزە ساڵ لەخۆی گەورەتر بوو.

بەڵێ دوژمنان ناتوانن بەر بە بڵاو بوونەوەی ئاینی ئیسلام بگرن ،ناچار هەموو ڕێگایەك بەکاردێنن بۆ ناشیرین کردنی ئەم ئاینە ، یەك لەو هۆکارانەی لەم سەردەمەدا کاری لەسەر دەکەن دروست کردنی گومان و دوودڵیە لەناو موسڵماناندا سەبارەت بە چەند شتێکی لاوەکی بۆنمونە دەڵێن: پێغەمبەر (ﷺ) بۆچی نۆ ژنی هێناوە، ،عائیشەی لە چەند ساڵیدا خواستووە،ئیسلام بۆچی لەشایەتیداندا دووژنی بەرامبەر پیاوێك داناوە...هتد ،دەیانەوێت بەم شتانە گومان و دوودڵی لەناو موسڵمانان و بەتایبەت لەناو لاوەکاندا دروست بکەن!لەم بارەوە نوێنەری بەریتانیا لە میسر دەڵێت: دەمانەوێت سەبارەت بە ئیسلام نەوەیەك لە موسڵمانان لە میسردا لەسەر گومان پەروەردە بکەین! کە هیچ شتێك لە ئیسلام نەزانن جگە لە گومان و دودڵی سەبارەت بە ئاین و پێغەمبەرەکەیان (ﷺ)!

زۆر سەیرە ئەم گاورو جولەکانە بیروباوەڕیان بەو شێوازەیەو هەمان کات دێن بە نەشیاوی سەبارەت بە پێغەمبەرەکەی ئێمە (ﷺ) قسە دەکەن.

جا سووکایەتی کردنی ئەم قەشانە بەپێغەمبەر (ﷺ) لە کۆڕو سیمینارەکاندا بووە بە دیاردەیەکی نەخشە بۆ داڕێژراو و بەئاشکرا دوژمنایەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن، سەیر بکەن! چۆن (جیری فاینز) کۆبوونەوەی ساڵانەی شاری (سانت لویس)ی ویلایەتی میسۆری ئەمریکی دەقۆزێتەوە بۆ تانەدان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)

وناوبراو دەڵێت: ئەو خوایەی کە موسڵمانان باوەڕیان پێیەتی ئەو خوایە نیە کە مەسیحیەکان باوەڕیان پێیەتی.

هەروەها دەڵێت: خوا تۆ ناکات بە تیرۆریست، بە تەقاندنەوەی خەڵك و بردنی گیانیان.

وتەکانی (جیری فاینز) هەمووی دژی ئیسلام و پێغەمبەرەکەیەتی (ﷺ)، لەگەڵ ئەوەشدا پشتگیری خۆی بۆ پارتی کۆماری دەرئەبڕێت و سوپاسی سەرۆکەکەشی دەکات.

## دووەم: سووکایەتی کردن بە کردەوە:

ئەم سووکایەتی کردنە لە مێژە هەیە، هەندێك لە مێژوو نووسان چەند هەوڵێکی (الفرنجه)یان بۆمان گواستوەتەوە کە بە نیاز بوون گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) هەڵ بدەنەوە جەستەی موبارەکی بدزن، بە مەبەستی ئەوەی موسڵمانان زیارەتی نەکەن.

ئیمامی زەهەبی دەفەرموێت: سەڵاحەدینی ئەیوبی خۆی بۆ ئەم کارە تەرخان کردو سەنگەری دانا، پاشان جێگرەکەی نارد بۆ میسر بۆ لای (سیف الدولة – ابن منقد) تا لەو ڕووەوە ئەویش ئامادەکاری بکات، ئەویش وتی: بێ خەم بە، بە ئەندازەی تاوانبارەکان کەلەبچەی لەگەڵ خۆیدا برد کە ژمارەیان لەسێ سەد کەس زیاتر بوون و هەندێکیان لە عەرەبە هەڵگەڕاوەکان بوون، جا لە نێوان ئەوان و مەدینەدا یەك ڕۆژیان مابوو ئەویش پێیان گەیشت و دەستی کرد بە بەخشینی ماڵ و ئاڵتوون، لەبەر ئەوە عەرەبەکان ڕوویان لێ کردو (الفرنجه)کانیش لەلای شاخێك دا خۆیان پەنادا، سەلاحەدینیش بەخۆیی و نۆ کەسەوە چوونە سەریان، ویستی خوای گەورە وەها بوو کە (الفرنجه)کان تێك شکان و خۆیان دا بەدەستەوە، پاشان دەستگیری کردن و بەرەو قاهیرەی بردن و دواتر لەناو بران.

هەروەها مێژوو نووسان باسی گاورو ڕافیزە باتنیەکانیان کردووە کە چەندین جار هەوڵیان داوە گۆڕی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵ بدەنەوەو خاوەنەکەی بدزن.

## هۆکارەکانی سووکایەتی کردن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەرکی ئێمەش لەو بارەیەوە:

لە سەرەتادا ئاماژەمان بە هەندێك هۆکار کرد، ئەویش ئەو دوژمنایەتیە کۆنەیە کە لەنێوان حەق و باتڵ دا هەبووەو هەیە، ئەو کەسانەش بە هەڵەدا چوون کە پێیان وایە دوژمنان پێغەمبەری ئیسلامیان (ﷺ) نەناسیوە بۆیە سووکایەتی پێ دەکەن، وەك چۆن لەکاتی سووکایەتی دانیمارکیەکان دا بڵاو بوویەوەو دەیان وت: ئەگەر بیان ناسیایە خۆشیان دەویست، لە بەرامبەردا خوای گەورە هەزار و چوار سەد ساڵ لەمەو بەر بەرپەرچی ئەم چەواشەکاریانەی داوەتەوەو پێمانی فەرمووە: خاوەن کتێبەکان پێغەمبەر دەناسن وەك چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسن: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمُ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٠﴾﴾ الانعام: ٢٠. بەڵێ زۆربەیان دەزانن کە پێغەمبەر (ﷺ) و پەیامەکەی ڕاست و درووستن، بەڵام لەبەر حەسوودی خۆیان بە ستەم دەیشارنەوە، هەروەك پێویستە هەموو ڕۆژئاوایی و خاوەن کتێبەکان بە یەك چاو سەیر نەکەین سەبارەت بە دژایەتی ئەوان بۆ ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، وەك قورئان دەفەرمووێت: ﴿لَيۡسُواْ سَوَآءٗۗ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ أُمَّةٞ قَآئِمَةٞ يَتۡلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ وَهُمۡ يَسۡجُدُونَ ﴿١١٣﴾﴾ ال عمران: ١١٣.

واتە: گاورو جوولەکەکان هەموویان یەکسان و چوونیەك نین، بەڵکو لە خاوەنانی کتێب دەستەیەك لە ئیماندارانیان هەن، ئایەتەکانی خوا لەکاتەکانی شەودا دەخوێننەوەو نوێژ دەکەن و سوژدە دەبەن.

کەواتە لەگەڵ ئەوەی کە ڕۆژئاواییەکان دژایەتی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەکەن، هەمان کات لە ڕۆژئاوادا دەیان نووسەرو بیرمەند هەن، سەبارەت بە پێغەمبەر (ﷺ) و بەرنامەکەی ئەهلی دادو ئینسافن، هەروەك لەپێشەوە ئاماژەمان بەوەدا کە لە

ڕووی هەڵوێستیانەوە سەبارەت بە ئیسلام ڕۆژئاواییەکانمان بەسەر پێنج گرووپ دا دابەش کرد، هەر لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین بڵێین کە لە ڕۆژئاوادا دەیان کەسی وەك (ئەمیر تشارلز) هەن، کە ناوبراو ڕایگەیاند:ئاینی ئیسلام و توندو تیژی هیچ پەیوەندییەکان بەیەکەوە نیە، هەمان کات بەرگری لە شارستانی ئیسلامی کردو فەزڵیدا بەسەر شارستانی ڕۆژئاوادا، کە واتە دەبێت موسڵمانان ڕێز لەم کەسانە بگرن و بەرەو ڕووناکایی ئیسلام دەستیان بگرن.

## چەند هۆکارێك پاڵنەرن هەتا سەرکردەو سەرۆکەکانی ڕۆژئاوا پشتگیری ئەو کەسانە بکەن کە دەست درێژی دەکەنە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لەوانەش:

١- دەیانەوێت ئەندازەی پەرچەکرداری موسڵمانان بزانن لەکاتێکدا هێرش دەکرێتە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)، هەندێك جار نەرمی نواندنی موسڵمانان دەقۆزنەوەو هێرش و بێ ئەدەبیەکانیان بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ) زیاتر دەکەن، هەروەك یەکێك لە قەشە دڕندەکان هێرشی کردە سەر پێغەمبەر (ﷺ) و بەپیاو کوژو شەڕانی و... ناوی برد. ! بیرمان نەچێت (بیرلسکۆن)ـی سەرۆکی ئیتالیاش بە ئاشکرا ئیسلامی تۆمەتبا کرد بەوەی کە ئاینی توندو تیژیە، هەروەها پاشای دانیمارکیش ڕایگەیاند کە ئیسلام ئاینێکی خوێناوییە،کەواتە لاوازی وبێ دەستەڵاتی موسڵمانان هۆکارێکی سەرەکیە هەتا ڕۆژئاوا هیچ ڕێزێك لە ئیسلام نەگرێت وحسابی بۆ نەکات! چونکە ڕۆژئاواییەکان کەلتورێکیان هەیەو تەنها لەکاتی بەهێزیتدا دەتناسن کە لاواز بوویت حسابت بۆ ناکەن،ئاشکرایە (کاسۆلیك وپرۆتستانت) و(جولەکەو گاورەکان) ناتوانن سوکایەتی بەیەکتری بکەن ؟چونکە هەردوو لایان خاوەنی هێزن!

٢- هاندانی شەقامی گشتی و ئاڕاستەکردنیان بەرەو دوژمنێکی هاوبەش و خەریك کردنی هاوڵاتیان هەتا کێشە ناوخۆیی و دەرەکی و ئابووریەکانی وڵاتیان بیر بچێتەوە.

٣- زۆرجار سەرکردەکانی ڕۆژئاوا بە مەبەستی بەدەست هێنانی زۆرترین دەنگ لەکاتی هەڵبژاردندا، پشتگیری ئەو کەسانە دەکەن کە بێ ڕێزی دەکەن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ).

٤- چاوپۆشی نواندن لە بەرامبەر شکستە سیاسی و ئابووری و سەربازیەکان داو، خەریك کردنی میللەت بەشتی لاوەکییەوە.

٥- پێداگری کردن لەسەر یەکێتی نەتەوەیی و، دروست کردنی لەمپەرو ڕێگری کردن لە بەردەم بانگەوازی ئیسلامی دا لەڕۆژئاوادا.

٦- لەم ڕێگەیەوە هەوڵی ئەوە دەدەن کە هاوپەیمان و هاوسەنگەر بۆ خۆیان دروست بکەن لە دوو ڕووان و هەڵگەڕاوان،دووبارە لە دژی ئیسلام بەکاریان دێننەوە.

٧- دوژمنان بەردەوام هەوڵ دەدەن لەم ڕێگەیەوە موسڵمانان خەریك بکەن، هەتا بواری کارکردن و بەرهەمهێنانیان نەبێت.

٨- ئامانجیان وروژاندنی شەقامی ئیسلامیە، سەبارەت بەچۆنیەتی چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، هەتا موسڵمانان دووچاری کێشەو ململانێ ببن.

٩- ئەم ڕێگەیە بەکاردێنن وەك فێڵێکی پێشوەخت، هەتا ڕێگری بکەن لەوەی کە موسڵمانان بگەنە ناوەندەکانی بڕیاردان لە دامەزراوەکانی ڕۆژئاوادا.

١٠- زۆر جار دوژمنان ئەم ڕێگەیە بەکار دێنن بەمەبەستی سەرقاڵ کردنی موسڵمانان و خەریك کردنیان،بەئامانجی ئەوەی بەئارەزووی خۆیان دەست لەکاروباری وولاتانی ئیسلامی وەربدەن .

## چەند ڕاسپاردەیەك:

* پێویستە زیاتر توێژینەوە بکرێت سەبارەت بە هۆکارەکانی بێ ئەدەبی کردن بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ)، وا باشترە ئەم بابەتە گرنگە بدرێتە چەندین توێژەر، هەتا هەریەکەو لەئاستی خۆی دا وردترین توێژینەوە بکات و هۆکارەکان و چارەسەریش دیاری بکات.

*پێویستە موسڵمانان چارەسەری ئەو دیاردانە بکەن کەچارەسەریان لە دەستی خۆیاندایە،وەك ڕاست کردنەوەی بارودۆخی خۆیان و فەرمان کردن بەچاکەو ڕێگری کردن لە خراپە.

*کارکردن و هەوڵدان بۆ یەکخستنەوەی ڕیزەکانی ئوممەتی ئیسلامی و وەلاتانی ناکۆکیەکان،ئەمەش هۆیەکی سەرەکیە بۆ گەڕاندنەوەی هێزو شکۆ بۆ ئوممەتەکەمان.

* پێویستە گرنگی زیاتر بەو کەسانە بدرێت کە شارەزاییان نیە سەبارەت بە پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) و لە نزیکەوە ئاشنا بکرێن و بەو پێغەمبەرە ئازیزە (ﷺ).

* گرتنە بەری چەندین هۆکاری جیاواز، بۆ ئەوەی بیسەلمێنین کە ئیسلام ئاینێکی بێگەردو جوانە، لەو هۆکارانەش هەوڵ بدرێت کە زۆرترین کەناڵی ئاسمانی ئیسلامی دابنرێن ، بە هەموو زمانەکان پەخشی خۆیان بکەن و هەمان کات گرنگی بدرێت بەچاپ کردنی ئەو کتێبانەی کە لەو بارەوە دانراون ،بە هەموو زمانەکان چاپ بکرێن و بەبێ بەرامبەرو وەك دیاری دابەش بکرێن..

* گرنگی زیاتر بدرێت بەو ڕۆژئاواییانەی کە بەرامبەر ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەهلی ئینسافن، پێویستە بەردەوام پەیوەندییان لەگەڵدا ببەسترێت و بانگهێشتی کۆنگرەو کۆڕو کۆبوونەوەو بۆنە ئیسلامیەکان بکرێن ، لە بەرامبەریشدا موسڵمانان سەردانیان بکەن و لێیان نزیك ببنەوە.

* پێویستە بەردەوام خۆمان بەهاوخەمی موسڵمانانی ڕۆژئاوا بزانین ، لە بەرامبەر ئەو مەترسیانەی ڕووبەڕوویان دەبێتەوە دڵیان بدەینەوەو نزای خێریان بۆ بکەین.

* لەبواری ڕاگەیاندا پێویستە چەند ناوەندێکی توێژینەوەو لێکۆڵینەوە بکرێنەوە کە گرنگی بدەن بە:

– ناساندنی ئیسلام بە ڕۆژئاواییەکان، بەو شێوەیەی کە خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەیانەوێت.

– دەرخستنی توندڕەوی ئاینی لەلای ڕۆژئاواییەکان و دیاری کردنی کردارە خراپەکانیان لەدژی موسڵمانان.

– وریایی دان بە کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی لەمەڕ ئەو مەترسیانەی کە ڕووبەڕووی ئەوان و مرۆڤایەتی دەبێتەوە، لەسەر دەستی لۆبی قەوارەی زایۆنی.

– دەرخستنی مێژووی ڕەشی خاچ پەرستان و ئاماژە کردن بە سەرجەم ئەو کوشتارگانەی کە لە دژی موسڵمانان ئەنجامیان داوە.

– دەرخستنی لایەنە جوانەکانی شارستانی ئیسلامی بۆ مرۆڤایەتی بەشێوەیەکی گشتی و ڕۆژئاواییەکان بەتایبەتی.

–جیاوازی بکرێت لەنێوان ئیسلام وەك ئاین و ،بارودۆخی ئێستای موسڵماناندا.

قسە وتن بە پێغەمبەر (ﷺ) لەنێوان شەریعەت و بانگەشەی ئازادی بیرو ڕادا

# قسە وتن بە پێغەمبەر (ﷺ) لەنێوان شەریعەت و بانگەشەی ئازادی بیرو ڕادا:

سەرجەم موسڵمانان بە جیاوازی بیروبۆچوون و مەزهەبیانەوە، خۆش ویستن و شوێن کەوتن و بە گەورە زانینی پێغەمبەر (ﷺ) بە پێویست دەزانن، هەروەك لە فەرموودەش دا هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: باوەڕی هیچ کەسێکتان تەواو دانامەزرێت هەتا منی لە هەموو کەسێك خۆشتر نەوێت.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ النساء: ٦٥.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ...﴾ الاحزاب: ٣٦.

کەواتە پێویستە بەجوانترین شێواز لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) هەڵسووکەوت بکەین و شوێنی سوننەتەکانی بکەوین و، هەموو ئەو هەواڵانە بەڕاست بزانین کە لەلایەن ئەوەوە پێمان ڕاگەیەندراون .

وەك زانایان ئاماژەیان پێداوە، تەنانەت لەکاتێك دا کە باسی پێغەمبەر کرا (ﷺ)، پێویستە موسڵمانان بەچاوی ڕێزو ئەدەبەوە گوێ بۆ فەرمایشتەکانی بگرن، چونکە پێشینانمان بەو شێوازە هەڵسووکەوتیان لەگەڵ پێغەمبەر دا (ﷺ) کردووەو تەنانەت پاش کۆچی دوایشی وەك ئەوەی زیندوو بێت ڕێزیان لەگۆڕو مزگەوت و فەرموودەکانی گرتووە.

(قاضي) دەفەرمووێت: لەمزگەوتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)، جەعفەری ئەمیری موسڵمانان بەتوندی قیڕاندی بەسەر مالیك دا، پاشان مالیك داوای لێ کرد کە لە

مزگەوتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەنگ بەرز نەکاتەوە.! چونکە پەروەردگار ئەو ڕەوشتەی فێری موسڵمانان کردووە: ﴿...لَا تَرْفَعُوٓا۟ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِىِّ...﴾ الحجرات: ٢.

هەروەها پەروەردگار وەسف و ستایشی ئەوانە دەکات کە لە ئاست پێغەمبەردا (ﷺ) دەنگی خۆیان دەخۆنەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَٰتَهُمْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمْتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰ ۚ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٣﴾﴾ الحجرات: ٣.

هەروەك سەرزەنشتی ئەوانەش دەکات کە لە دەرەوەی ژوورەکان و لە دوورەوە بانگی پێغەمبەر(ﷺ) دەکەن: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾﴾ الحجرات: ٤.

قسە وتن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنێوان شەریعەت و بانگەشەی ئازادی بیروڕادا:
ئەم بابەتەمان بۆ دوو باسی سەرەکی دابەش کردووە ئەوانیش بۆچوونی شەرع چییە لەبارەی قسە وتن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، هەمان کات هەوڵ دەدەین لەڕووانگەی ئازادی بیرو ڕاوە قسە لەبارەی بابەتەکەوە بکەین، کە ڕۆژئاواییەکان ئەمە دەکەنە بیانوو بۆ هێرش کردنە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ).

# باسی یەکەم

## قسە وتن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و جۆرەکانی:

مەبەست لە قسە وتن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەیە کە شتێك لەدژی بوترێت لە پێگەو ڕێزی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە (ﷺ) کەم بکاتەوە، قسە وتن بە پێغەمبەر (ﷺ) چەندین جۆرە، لەوانەش:

یەکەم: (التصریح) بریتیە لە قسە وتن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا کە هیچ بیانو و لێکدانەوەیەك هەڵنەگرێت، ئەمەش خراپترین جۆری قسە وتنە بەپێغەمبەری خوا (ﷺ).

دووەم: (التعریض): ئەمەش لەڕێی توانج و هێماو تەعلیق دانەوە ئەنجام دەدرێت.

لە قسە وتن بە پێغەمبەری خوادا (ﷺ) (التعریض) هاوشێوەی (التصریح)ە، ئەمەش بۆچوونی زانایانی حەنەفی و مالیکی و شافعیی و حەنبەلیەکانە، وە هەندێك لە زانایانیش دەڵێن (التعریض) وەك (التصریح) نیە، هەمان کات (قاضي عیاض) دەفەرمووێت: هەموو زانایانی پێشین و پاشین لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە قسە وتنی (التعریض) هاوشێوەی (التصریح)ـە.

هەر لەم بارەوە ئیبن تەیمیە دەفەرمووێت: هاوەڵان فەرموویانە: قسە وتن و (التعریض) بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) مرۆڤ لە ئیسلام دەباتە دەرەوەو، پێویستە خاوەنەکەی هاوشێوەی ئەو کەسەی کە بە (التصریح) قسەی بە پێغەمبەر وتووە بکوژرێت.

سێیەم: قسە وتن بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ):

قسە وتن بە هاوەڵان واتە قسە وتن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لەم بارەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەسێك قسە بە هاوەڵەکانم بڵێت ئەوە قسەی بە من وتووە، هەروەها (إبن أبي عز) دەفەرمووێت: هەر کەسێك قسە بە وەزیرەکەی

پێغەمبەر (ﷺ) بڵێت، ئەوە وەك ئەوەیە کە قسەی بە پێغەمبەر (ﷺ) وتبێت، هەر کەسێك بڵێت ئەبووبەکر دوژمنی ئیسلامە، ئەوە تۆمەتی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و ئوممەتەکەی درووست کردووە.

چوارەم: قسە وتن بە سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ):

قسە وتن بە سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و بە سووك سەیر کردنیان و لەئاست کەم کردنەوەیان هاوشێوەی گاڵتە کردنە بەپێغەمبەری خوا، چونکە لەلایەك سوننەتەکان بەشێك بوون لەو پێغەمبەرە ئازیزە (ﷺ) و، هەمان کات لەپاش قورئان بە سەرەکی ترین سەرچاوە دادەنرێن هەتا موسڵمانان دەستیان پێوە بگرن و گومڕا نەبن.

کەواتە گاڵتە کردن بە سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، هاوەڵەکەی بەرەو هەڵگەڕانەوەو تیاچوون دەبات و، بەردەوام بوون لەسەر ئەو ڕەوشتە نا دروستە، دەبێتە هۆی حەڵاڵ کردنی خوێنی خاوەنەکەی.

# باسی دووەم

## حوکمی قسە وتن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ):

ئاشکرایە کە قسەوتن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند مافێکی پێوە پەیوەستە ،هەتا لەو کەسە بسەندرێت کە قسەی بەپێغەمبەر (ﷺ) وتووە لەوانەش:

**١- مافی خوای گەورە:**

قسە وتن بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) و تانە دان لەخۆیی و ئاینەکەیی و بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەر (ﷺ)، بەدرۆ خستنەوەی خوای گەورەیە، لەم ڕووەوە هەر کەسێك قسە بە پێغەمبەر (ﷺ) بڵێت، ئەوا سەرەتا مافی پەروەردگارەو چۆنی بوێت دەتوانێت تۆڵەی خۆی لەو کەسە بکاتەوە.

**٢- مافی سەرجەم موسڵمانان:**

ئاشکرایە موسڵمانان هەتا باوەڕ بە پێغەمبەر (ﷺ) نەکەن باوەڕەکەیان دانامەزرێت، هەمان کات هەموو کاروباری ئاینی و دونیاییەکانی خۆیان لەژێر ڕۆشنایی فەرمانەکانی پێغەمبەردایە (ﷺ)، دەتوانین بڵێین سەرجەم ئەو چاکانەی لە دونیاو دواڕۆژدا دەست گیری موسڵمانان دەبێت بەهۆی پێغەمبەرەوەیە (ﷺ)، لەبەر ئەوە قسە وتن بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) لەلای موسڵمانانیش بە گەورەترین تاوان ئەژمار دەکرێت و، پێیان خۆشە کە هەموو سووکایەتییەك بەخۆیان و باو و باپیریان بکرێت، بەڵام بچووکترین بێ ڕێزی بەپێغەمبەر (ﷺ) نەکرێت.

**٣- مافی پێغەمبەری خوا (ﷺ):**

وەك چۆن سەڵاوات دان لەدیداری بەزیندوویی و مردوویی بەپێغەمبەر (ﷺ) دەگات، بە هەمان شێوە قسە وتن بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بە مردوویش ئازاری دەدات، دەتوانین بڵێین سووکایەتی کردن بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) و قسە پێ وتن و هەتك کردنی تاوانێکە لە کوشتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەورەترە، چونکە کوشتن

یان مردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ کاریگەری نابێت بۆ سەر گەورەیی خۆیی و ئاین و بەرنامەکەی، هەمان کات کاریگەری نابێت بۆ دوورکەوتنەوەی خەڵکی لە ئاینی ئیسلام، بەڵام بوختان کردن و قسەوتن و هەتك كردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر دەروونی هەندێك کەس بەجێ دەهێڵێت و بەهۆیەوە لەئیسلام هەڵدەگەڕێنەوەو ڕەنج بە خەساری دونیاو قیامەت دەبن.

## قسە وتن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) حوکمەکەی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە

### یەکەم: ئەگەر ئەو کەسە موسڵمان بێت:

زانایان یەکدەنگن لەسەر بێ باوەڕ بوونی موسڵمانێك، لەکاتێکدا ئەگەر قسەی بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) وت، لەم بارەشەوە لەنموونەی وتەی زانایان زۆرە، وەك:

– (اسحاق بن راهویە) دەفەرمووێت: هەموو زانایان یەکدەنگن لەسەر بێ باوەڕ بوونی ئەو کەسەی قسە بەخواو پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێت، یان بێ ڕێزی بەرامبەر قورئان بکات، یاخود پێغەمبەرێکی لە پێغەمبەرانی خوای شەهید کردبێت (ئەمە لەکاتێکدایە ئەگەر کابرا بڕوای بە هەموو فەرمایشتەکانی خواو پێغەمبەریش هێنابێت).

– هەروەها (محمد بن سحنون) دەفەرمووێت: زانایان یەکدەنگ و کۆکن لەسەر بێ باوەڕ بوونی هەر کەسێك کە قسە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڵێت و لە پێگەو ڕێزی کەم بکاتەوە، هەروەها لەلایەن خوای گەورەوە سزایەکی سەختی بۆ ئامادە کراوە، حوکمی ئەو کەسەی قسە بەپێغەمبەر (ﷺ) دەڵێت کوشتنە، بێ بڕواییە هەر کەس گومانی لە بێ بڕوا بوونی جنێو دەرەکە هەبێت.

– شێخی ئیسلام (أبـو العبـاس) دەفـەرمووێت: زانایـانی شـوێنکەوتەی هـەر چـوار مەزهەبەکـە وجگـە لـەوانیش لـە سـەر ئـەوە یەکـدەنگن، کەهــەر موسـڵمانێك قـسە بەپێغەمبەر بڵێت، پێویستە و دەبێت بکوژرێت، چونکە بەوە لە ئاینی ئیسلام دەچێتە دەرەوە.

– هــەروەها (ابــن قدامــە) ی مەقدیـسیش دەفــەرمووێت: دژایــەتی و قــسەووتن بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) خاوەنەکەی لە بازنەی ئیسلام دەباتە دەرەوە.

کەواتە هەرکاتێك بیٚ بڕوابوونی ئەوکەسە سـەلمێنرا، ئـەوا پێویـستە کاربەدەسـت و قازی موسوڵمانان سزای هەڵگەڕاوەی بەسەر دا جێبەجیٚ بکات، ئـەو حوکمـەش بریتیـە لەکوشـتنی کـابرای لـەدین هەڵگـەڕاوە، لـەم بارەیـەوە چـەندین بەڵگـە لەبەردەسـتدان بەنموونەش وەك:

– (ابن المنذر) دەفەرمووێت: زانایـانی شـارەزاو تێگەیـشتووی ئیـسلام لەسـەر ئـەوە یەکدەنگن هەر کەسێك قسە بەپێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) بڵێت، پێویستە بکوژرێت.

– هەروەها (خطابی) ش دەفەرمووێت: لەناو زانایاندا کەسێك شك نابـەم، سـەبارەت بە کوشتنی ئەو کەسەی قسە بەپێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) بڵێت، بـیرو ڕاو بۆچـوونی جیاواز بێت.

## دووەم: ئەگەر ئەو کەسە ئەهلی زیممە بوو:

ئەگــەر زیممیـەك قـسە بەپێغەمبـەری نازدارمـان (ﷺ) بڵێـت، ئـەوا ئـەو بێڕێـزی نواندنەی دەبێتە هۆی:

أ– هەڵوەشاندنەوەی ئەو پەیمانەی کەلە نێوان ئێمەو ئەواندا هەیە.

ب– ئەو بێڕیزی و بەزاندنی سنوورە دەبێتە هـۆی ئـازاردانی شـوێنکەوتوانی ئـاین و بەرنامەکـەی خـوای گـەورە و ،تانـە دانـی لەپێغەمبـەر بـەتاوان ئـەژمار دەکرێـت و پەیمانەکە هەڵدەوەشێنێتەوە.

هەر سەبارەت بە حوکمی زیممی، ئیبن تەیمیە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) جێگیر بووە، فەرمانی داوە بەکوشتنی ئەو کەسەی قسەی پێ وتووە، لەبەر ئەوە فەرمانی کوشتنی بۆ دەرچووە کە قسەی ناشیرینی بە پێغەمبەرمان (ﷺ) وتووە نەك لەبەر ئەوەی پەیمان شکێنی کردووە، ئەگەر لەکاتێکدا سەلمێنرا قسەی وتووە، ئەوا کوشتنی واجب دەبێت و،خاوەن پەیمانیشی نابێتە هۆی ئەوەی حوکم و سزاکەی بەسەردا جێبەجێ نەکرێت، چونکە کەسە زیممیەکە ڕاستەوخۆ بەقسە وتنەکەی پەیمانەکەی هەڵدەوەشێتەوەو، دەست بەجێ بەوە دەچێتە ڕیزی بێباوەڕە حەربیەکانەوە ،ئەگەر موسوڵمانیش ئەو کارەی کرد(قسەوتن و بێڕێزی نواندن)، ئەوا بە (لەدین هەڵگەڕاوە) لەقەڵەم دەدرێت و، کوشتنی کەسێکی هەڵگەڕاوە لەکوشتنی کەسێکی زیممی و بێباوەڕێکی ئەسڵی پێویستترە.

پێشتر ئاماژەمان بەوەدا هەر بێباوەڕێکی زیممی قسەی بە پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) ووت، ئەوا بەو کردەوە وهەڵوێستەی پەیمانەکەی لەگەڵ موسوڵمانان هەڵدەوەشێتەوەو،ئیدی بەبێباوەڕی جەنگی لە قەڵەم دەدرێت وکوشتنی پێویست دەبێت، لەم بارەیەوە بەڵگە زۆرە وەك:

یەکەم: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿٥٧﴾﴾ الاحزاب: ٥٧. واتە: بێگومان ئەوانەی ئازاری خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی دەدەن، خوای گەورە نەفرینیان لێدەکات و،لە دونیا ودواڕۆژیشدا سزایەکی ئابڕوبەرانەیان دەدات.

دووەم:هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَإِن نَّكَثُوٓا۟ أَيْمَـٰنَهُم مِّنۢ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا۟ فِى دِينِكُمْ فَقَـٰتِلُوٓا۟ أَئِمَّةَ ٱلْكُفْرِ ۙ إِنَّهُمْ لَآ أَيْمَـٰنَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ ﴿١٢﴾﴾ التوبە: ١٢. واتە: خۆ ئەگەر ئەوانە پەیمانەکانیان بشکێنن لەپاش بەستنی و ،گاڵتە وتانە وتەشەریان لەئاین وبەرنامەکەتان دەدا، ئەوە لەوکاتەدا پێویستە لەگەڵ سەرانی کوفر

بجەنگێن وبیان کوژن، بەڕاستی ئەوانە هیچ پەیمان و بەڵێن بردنە سەریکیان نیە، بەوەش کۆڵیان پێدەدەن و لەو بێباوەڕیەیان وازیان پێدەهێنن.

(حصاص) دەفەرموویت: ڕووی دەرەوەی ئایەتەکە پێمان دەڵێت: ئەگەر دەر کەوت یەکێك لە ئەهلی زیممی قسەی بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) ووت، ئەوا پێویستە دەست بەجێ بکوژرێت.

هەروەها ئیمامی عەلی فەرموویەتی: جوولەکەیەك جنێوی بەپێغەمبەری خوا دا (ﷺ) ، دواتر موسوڵمانێك لەسەر ئەوکارە جوولەکەکەی کوشت، هەواڵی ڕووداوەکە بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشت و، پێغەمبەریش (ﷺ) بەرپەرچی ئەوەی دایەوە کە خوێنی جوولەکەکە بدات.

## سێیەم:ئەگەر ئەو کەسە بێ باوەڕی جەنگاوەر بوو:

لەم حاڵەتەدا کوشتنی پێویست تر دەبێت، چونکە لەگەڵ ئەوەی بێباوەڕە، لەهەمان کاتدا دووسیفەتی تێدا کۆبوونەتەوە، ئەوانیش بریتین لە: جەنگ کردنی موسوڵمانان و قسە ووتن بە پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ).

لەو بارەیەوە (عبدالرحمانی کوری عوف) دەفەرموویت: لەجەنگی بەدردا لەناو ڕیزەکانی شەڕدا سەرگەرمی شەڕو پێکدادان بووین، بەلای ڕاست و چەپی خۆمدا لام کردەوە، دوو کوڕی لاوی بەجەرگم بینی ترسام لەوەی شتێکیان لێبێت، یەکێکیان بە دزی ئەوی تریانەوە پێی ووتم: ئەرێ مامەگیان (ابوجهل) کامەیە؟ ووتم: کوڕم چ کارێکت بەو هەیە؟ منداڵەکە ووتی: بیستوومە جنێوی بەپێغەمبەرمان (ﷺ) داوە، سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە، تارماییەکەی ببینم،یان دەبێت بمکوژێت یان دەبێت بیکوژم! بەڕاستی لەو ئازایەتی و جوامێریەی ئەومنداڵە سەرسام بووم!

هەر ئەو یاوەرە بەڕێزە دەڵێت: ئەوی تریشیان هات و هەمان پرسیاری یەکەمی لێ پرسیم، منیش لەوکاتەدا (ابوجهل) م بەرچاو کەوت وپێم نیشان دان، هەر کەبینیان

بەرەو ڕووی چوون و هەڵیان كوتایە سەری و زۆر بەشێرانە شمشێریان لێ بەرزكردەوە وكوشتیان.

پاشان چوونەوە خزمەتی پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) و هەواڵەكەیان پێ ڕاگەیاند ، ئەویش پێی فەرموون كامتان كوشتی؟ هەریەكەیان دەی ووت من كوشتم، ئازیزمان (ﷺ) پێی فەرموون شمشێرەكانتان سڕیوەتەوە ؟ ووتیان: نەخێر، پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) سەیری شمشێرەكانیانی كرد و پێی فەرموون: هەردووكتان كوشتوتانە.

# باسی سێهەم

## قسە وتن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنێوان شەریعەت و بانگەشەی ئازادی بیروڕادا:

چەمکی ئازادی: مەبەست لەئازادی توانای مرۆڤە بۆ ئەنجام دان یان واز هێنان لەشتێك، بەمەرجێك بە ئارەزوو ویستی خۆی بێت، ئەمەش حەزێکە هەموو مرۆڤێکی ژیر ئارەزووی دەکات.

## تێگەیشتن لە چەمکی ئازادی لەشەریعەتدا بەجۆرێکە و لەلای خەڵکانی تریش بەجۆرێکی تر خوێندنەوەی بۆ دەکرێت:

### یەکەم: چەمکی ئازادیەکان لە شەریعەتدا:

چەمکی ئازادیەکان لەئیسلامدا فراوانە وهەموو مافێکی بەمرۆڤ داوەو، هەمان کات کۆمەڵێك (مەرج)ی داناوە، هەتا فەوزاو نائارامی نەیەتەکایەوە، ئەو(مەرج)انەش وەك:

ا- مرۆڤ نابێت ئازادی خۆی بەکار بێنێت بۆ بەزاندنی سنوورەکانی پەروەردگار.

ب- پێویستە ئازادیەکانی تاك وکۆمەڵ نەبنە هەڕەشە بۆ سەر سیستەمی گشتی.

ج- نابێت ئازادی خۆی بەکار بێنێت بۆ زیان گەیاندن بە ئازادی ئەوانی دیکە.

لە ئیسلامدا ئازادی بەو واتایە نایەت کە ئەو ووشەیە بقۆزرێتەوە ،بۆ ئەنجامدانی کاری ناشەرعی و نابەجێ و بەزاندنی سنوورە قەدەغە کراوەکانی پەروەردگارو، تێر کردنی ئارەزوەکان لەسەر حیسابی خەڵکی ترو بەشێوەیەکی ناشەرعی، یاسایەك کە رێگە بەو ناشەرعیانە بدات پێی ناوترێت ئازادی، لەڕاستیدا ئەوە فەوزایە، بەهەڵە لە

ئازادی گەیشتنە، لەبەر ئەوە ئیسلام ئەو بۆچوونە چەوتەی ڕاست کردەوە و، ئازادی ڕاستە قینەی بۆ مرۆڤەکان فەراهەم کرد.

ئیسلام ڕێگە نادات خەڵك بەکۆیلە بکرێت، هەمانکات ڕێگەش نادات کەماف وئازادیەکانیان پێشێل بکرێن، ئیسلام ئامانجی ئەوەیە هاو سەنگی لەژیانی مرۆڤەکاندا بەدی بێت و بەڵام نابێت بەناوی ئازادیەوە سنوورە قەدەغەکراوەکان پێشێل بکرێن.

هەر لەم بارەوەخوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿......تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ البقرة: ١٨٧.واتە:....جائەوانەی باسکران چەند سنوورێکی خوای گەورەن و مەیان بەزێنن و نزیکیان مەکەون، ئابەو شێوەیە خوای گەورە ئایەت و ڕێنموونیەکانی خۆی ڕوون دەکاتەوە بۆ ئەوەی خەڵکی پارێزکار بن.

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿.....تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ البقرة: ٢٢٩. واتە:... دڵنیا بن ئا ئەو شتانەی باسکران سنوورەکانی خوای گەورەن، ئیدی لێی مەترازێن و سنوورشکێنی مەکەن، ئەوەی دەست درێژی بکاتە سەر سنوورەکانی خوای گەورە، بەڕاستی لە ستەمکارانە.

پێم باشە سەبارەت بە ئازادی بیرو ڕا لە ئیسلامدا ئەم ڕووداوە بیری هەموان بخەمەوە: ئەوە (عمری کوری خطاب)ە ئامۆژگاری خەولەی کچی حەکیم وەردەگرێت، ئەمە لە کاتێکدایە کە ئیمام عومەر لە سەر گوێدرێژەکەی بوو خەڵکێکی زۆریشی لەگەڵدا بوو،لەو کاتەدا خەولە ئیمام عومەری وەستاند و دەستی کرد بە ئامۆژگاری کردنی و لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا بەدەنگی بەرز پێی ڕاگەیاند: ئەی عومەر پێشتر پێت دەووترا عومەیر، دواتر بوویتە عومەر ، ئێستاش پێت دەوترێت ئەمیری باوەڕداران، کەواتە ئەی عومەر لەخوای گەورە بترسە!؟ چونکە هەر کەس لەمردن دڵنیا بێت، ئەوا لە تیاچوون دەترسێت، هەر کەس لەلێپرسینەوە دڵنیا بێت، ئەوا لە سزاش دەترسێت، ئەویش وەستا بوو بە جوانی گوێی بۆ گرتبوو، پێی ووترا: ئەی

ئەمیری باوەڕداران ئاوا دەوەستیت بۆئەم پیرە ژنە؟ئەویش فەرمووی :ئەگەر لە سەرەتای ڕۆژەوە تا کۆتایی ڕۆژ بیگرتمایە هەر دەوەستام!مەگەر بۆ نوێژە فەرزەکان لام چۆڵ بکردایە!ئایا ئەزانن ئەم پیرەژنە کێیە؟ئەمە خەولەیە!! .بەڵێ ئەمە تەواوی ئازادیە،ئەمە هەر ئەو عومەرە بوو کە دەیگوت:ئەی پێغەمبەری خوا وازم لێ بێنە با بدەم لە گەردنی ئەم پیاوە دوو ڕووە!

## دووەم: چەمکی ئازادیەکان لەلای عەلمانیەکان و ئەوانەش وەك ئەوانە بیر دەکەنەوە:

چەمکی ئازادی لای عەلمانیەکان بریتیە لە ئازادی ڕەها (مطلق)، بە شێوەیەك کە هیچ دەستورێکی ئاسمانی نەبێتە لەمپەر لەبەردەمی ئەو ئازادیە ڕەهایەدا، ئەوان لەو باوەڕەدان تەنها یاساکانی مرۆڤ بۆیان هەیە دەقەکانی ئازادی دابڕێژێن و، نابێت ئاینە ئاسمانیەکان لەو ڕووەوە خۆیان هەڵبقورتێنن، وەك دەڵێن:( ئاین بۆ خواو نیشتیمان بۆ هەموان) ،ئەمەش هەر وەك وتەکەی بەنو ئیسرائیلە کە بەپێغەمبەر مووسایان ووت:خۆتان و خواکەتان لەگەڵ بەرانبەرەکانتاندا بجەنگن، ئێمە ئالێرەدا دادەنیشین و توانای بەرەنگار بوونەوەمان نیە.

لەڕاستیدا ئەمە فەوزاو پشێویەو هەڕەشەیەکی ئاشکرایە بۆ سەر ئاشتی وئاسایشی نیشتیمان وکۆمەڵگەکەمان و،هەمان کات ئەو خوێندنەوە چەوتەی ڕۆژئاواییەکان بۆ ئازادی چەندین زیانی گەورەی هەیە وەك:

یەکەم: قۆستنەوەی ئازادی بۆ بەزاندنی هەموو سنوورە قەدەغەکراوەکانی شەرع ، بەو بیانوە وە هەموو بێ ڕێزیەك بەرانبەر پیرۆزیەکان دەکرێت.

دووەم: دوور خستنەوەی (فەرمانکردن بەچاکە ورێگری کردن لەخراپە) بە بیانووی ئەوەی کە ئەم فەرمان و نەریێ کردنە ئازادیەکان کۆت دەکات.

لە و چوار چێوەیەداو بەو بیانوەوە، قسە بەخوای گەورەو پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) دەوترێت، ئازادی بیروڕا دەکەنە بیانوو بۆ بڵاوکردنەوەی ژەهرو داخی مێژینەی دڵیان لە دژی فەخری کائیناتمان.

# باسی چوارەم

## گومانی عەلمانیەت و بانگەشەی ئازادی:

### گومانی یەکەم: ترساندنی خەڵك لە ئیسلام:

عەلمانی و هاوشێوەکانیان بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدان خەڵکی بترسێنن و لەئاینی ئیسلام دووریان بخەنەوە،وەهای لەخەڵك دەگەیەنن ئیسلام ئاینێکی داخراوەو، دژی ئازادی مرۆڤەکانە، دەڵێن پێویست ناکات کەسێك بکوژرێت لەبەر ئەوەی قسەی بە پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) وتووە، وەهاش خۆیان نمایش دەکەن کەلە بەرژەوەندی ئیسلام ئەم قسانە دەکەن و، فرمێسکی تیمساحی دەرێژن و دەڵێن: ئەگەر بەهۆی قسە وتن بە پێغەمبەر (ﷺ)، کەسێکی موسڵمان یان بێباوەڕ بکوژرێت، ئەوا ئەمە دەبێتە هۆکاری دوورکەوتنەوەی خەڵکی لە ئیسلام!

### گومانی دووەم: زۆر کردن لە ئایندا نیە:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ ...﴾ البقرة: ٢٥٦.

زۆربەی عەلمانیەکان ئەم ئایەتە بۆ گومڕاکردن ولە خشتە بردنی خەڵك بەکاردەهێنن ودەڵێن: مرۆڤ هەر چیەك بڵێت پەیوەندی بەخۆیەوە هەیەو،تەنانەت دەتوانێت ئاینەکەشی بگۆڕێت، بەردەوام عەلمانیەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان، لەسەر ئەم چەمکە کار دەکەن، زانایانیش بەرپەرچی بۆچوونەکانیان دەدەنەوەو، ڕاڤەکارانیش یەکدەنگن لەسەر ئەوەی نابێت زۆر لەکەس بکرێت هەتا بێتە ناو ئاینی ئیسلامەوە، هەمووکەس دەبێت بە قەناعەتی خۆی موسڵمان بێت، چونکە پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿.....قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ ....﴾ البقرة: ٢٥٦.

بەکورتی لە ئاینی ئیسلامدا هیچ بەڵگەیەك نیە کەشەرعیەت بداتە قسەوتن بەخواو پێغەمبەر (ﷺ) و ئیسلام وقورئان.

عەلمانیەکان دەڵێن: پێویست ناکات کەسێك لەبەر قسەوتن بەپێغەمبەر و، ئاین گۆڕین بکوژرێت! ئەگەر ئەو قسەیەی ئەوان ڕاست بێت، ئەی بۆچی پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرمووێت: هەرکەس ئاینی خۆی بگۆڕێت، دەبێت بکوژرێت، یان بۆچی لەبەر ئەوەی کەعبی کوڕی ئەشرەف قسەی بە پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) ووت! ئازیزمان (ﷺ) فەرمانی کوشتنی بۆدەرکرد، لەم بارەیەوە چەندین بەڵگەی ترمان لەبەردەستدان.

# باسی پێنجەم

## گرتنەبەری چەند ڕێو شوێنێکی ئەقڵی ولۆژیکی:

### یەکەم: ئایا لە ڕۆژئاوادا ئازادی بوونی هەیە، هەتا ڕەوایی بدرێتە قسەووتن بە پێغەمبەری ئازدارمان (ﷺ):

ڕۆژ ئاواییەکان لە مەڕ ئازادیەکان و بەتایبەت بەرانبەر بە ئیسلام شتێکیان نیە بەناوی هێڵی سوورەوە، لەڕاستیدا بەرانبەر بەئاینی ئیسلام ئەم هێڵە نیە وەك دواتر ئاماژەی پێدەکەین. ئیدی بەردەوام بە بیانووی بیروڕای ئازادەوە، ڕەوایی دەدەنە قسە وتن بەپێغەمبەری خوا (ﷺ)، وتمان ڕۆژئاواییەکان بانگەشە بۆ ئازادی ڕەها دەکەن! بەڵام بەم چەند نموونەیە دەیسەلمێنین کەلەڕۆژئاوادا، تەنها قسەوتن بە خوا وپێغەمبەر (ﷺ) ڕیگە پێدراوەو، بەپێچەوانەوە هەر شتێك زیان لە بەرژەوەندیەکانی خۆیان بدات، هێڵێکی سووریان بۆداناوە بۆنموونە:

أ- لەساڵی ١٩٩١دا،(جێنتەر دیکارت)ی سەرۆکی پارتی نیشتیمانی دیموکراسی ئەڵمانی کە(پارتێکی چەپی توندڕەوە) کۆڕێکی بۆ گیرا بوو، ناوبراو لەکۆڕەکەیدا ڕایگەیاند: ڕووداوی کوشتنی جوولەکەکان بەگازی ژەهراوی شتێکی بێ بنەماو دوور لە ڕاستیە، هەر بۆیە ڕاستەوخۆ لەدوای دەربڕینی ئەو بۆچوونەی ڕاپێچی دادگاکرا.

ب- لەمانگی ئازاری ١٩٩٤دا، جارێکی دی (دیکارت) دادگایی کرایەوە و، بۆماوەی ساڵێك خرایە بەندینخانەوەو هەمانکات سزاش درا، ئەمەش بووە هۆی بەرز بوونەوەی دەنگی تووڕەیی وناڕەزایەتی لەلایەن هەندێ دادوەری ترەوە، بەرانبەر ئەو دادوەرانەی کە دادگایی دیکارتیان کرد. بەهۆی ئەو سزا توندەی بەسەریدا سەپێنرا.

سەرەنجام بووە هۆی ئەوەی دادگای فیدراڵی دەست بخاتە کارەکەوەو، ئەنجامی سزاکەیان پووچەڵ کردەوەو، فەرمانی دووبارە دادگایی کردنەوەی تەمیز کرایەوە.

جـ-لەنیسانی ساڵی ١٩٩٤دا ، دادگای دەستووری ئەڵمانی ئەوەی ڕاگەیاند: هەوڵدان بۆ بەدرۆ خستنەوەی کارەساتی (هۆلۆکۆست) ی جوولەکە،ناچێتە چوارچێوەی ئازادی بیروڕاوە،دەستووری وڵات (هۆلۆکۆست) بەهێڵی سوور دەزانێت، ئەمەش هاندەربوو هەتا پەرلەمانی ئەڵمانی یاسایەك لەدژی ئەو کەسانە دەربکات کە سیناریۆی (هۆلۆکۆست) بەدرۆ دەخەنەوە. شایانی ئاماژەپێدانە نکوڵی کردنی (هۆلۆکۆست) لە ئەڵمانیادا بەتاوان ئەژماردەکرێت و، سزاکەشی بە چاوپۆشیەوە پێنج ساڵ زیندانیە ! ؟

د- لەساڵی ١٩٩٣دا، دەقی وەرگێڕدراوی کتێبی ئەمریکی (العین بالعین)، بەزمانی ئەڵمانی چاپ کراو، هەمانکات بڵاوکارەکەشی هۆشداری مەترسی بارودۆخەکەیدا،پاشان ڕاستەوخۆ دەست کرا بەڕاکێشانەوەی کتێبەکە لەبازاڕدا وسووتێنرا، بیانوویان بۆ سووتاندنی کتێبەکە ئەوە بوو،دەیان گووت ڕای گشتی جەماوەری ئووڕەکردووە، چونکە لەکتێبەکەدا باس لەوە دەکرێت (ستالین) پاش جەنگی دووەمی جیهانی بە ئەنقەست جووەکانی دەست نیشان کردووە بۆ ئەوەی لە پۆڵەندە وەك پۆلیسی نهێنی کاربکەن.

هـ- لەنەمساش لەڕێگەی یاساوە، سزای یاسایی ئەو کەسە دەدەن نکۆڵی لەهەبوونی ژووری نهێنی گازی ژەهراوی بکات، ئەمەش لەجەنگی دووەمی جیهانی دا لەلایەن نازیەکانەوە دژی بەندیەکانیان بەکارهاتووە.

و- لە فەرەنسادا هەر کەسێك لەکاتی قسە کردندا وەك ڕیکلام دەستەواژەی بەریتانی بەکاربهێنێت ڕووبەڕوی دادگایی و زیندانی کردن دەبێتەوە !

## دووەم: ئایـا ئـەزموون و تـاقیکردنـەوەکان پێویـستی هـەبوونی کـۆت و بەندیان لەسەر ئازادیەکان نەسەلماندووە؟

هـەموو فیترەتێکـی سـاغ و واقیعـیش ئەوشـاهیدیە دەدەن، کـە پێویـستە ئـازادی سنووری هەبێت، هەتا ئەو ئازادیە بـۆ مـەرام ومەبەسـتێکی تایبـەتی و نانـەوەی شـەڕو ئاژاوە بەکار نەهێنرێت.

ئەوە ڕۆژئاواییەکانن کەبانگەشەی ئازادی ڕەها دەکەن، بـەلآم سـەردەم وبـارودۆخ و بەرژەوەندیەکانیان دەخوازێت کەسـنوور بـۆ ئـازادی دابنرێـت، بـەلآم کاتێـك بابـەتێکی تایبەت بە ئیسلام و پێغەمبەر (ﷺ) دێتە ئاراوە، دەسـت بـەجێ دەیکەنـە خـۆراکێکی چەوری سفرەوخوانەکانیان و پێی دەلەوەڕێن و،بەبیانووی ئازادی بیرو ڕا دەربڕینـەوە، بیروڕا پیس وگلآوەکانیان بەچەشنی ژەهری ناو هەنگوین دەرخواردی خەڵکی دەدەن.

### نموونەی ئەو یاسایانەش کەلە ڕۆژئـاوادا ئـازادی سنووردار دەکەن ئەمانەن:

- یاسای باج وسەرانە: بەهۆیەوە ئازادی تاکەکەسی سنووردار دەکەن.
- یاسای هاتوو چۆ: کە سەربەستی جموجووڵ سنوور دار دەکەن.
- یاسای هەڵبژاردنەکان کەسنووری داناوە بۆ ئازادی لەکاروباری سیاسیدا.

کاتێك تەماشایەکی ڕۆژئاوا دەکەیت سەرت سوڕدەمێنێت لەو هەموو کۆت وبەنـدەی کەلەسەر ئازادیەکانیان دانراوە، بەلآم لەهەمان کاتدا پیرۆزیەکانی موسـوڵمانان بـەناوی ئازادی بیروڕاوە ڕووبەڕووی هێرش بوونەتەوەو،هیچ لایـەنێکی پەیوەندیـدارو دەسـەلآت بەدەست، بەردەمی ئەو دەسـت درێـژ کـاری و هێـرش وسـووکایەتیانە ناگرێـت و هـیچ سـزایەکیان بـۆ ئـەو سـنوور شـکێنیەش دانـەناوە! لـەم سۆنگەیەشـەوە لـەڕۆژئاوادا کێبەرکێیە لەسەر ئەوەی کێ هێرشی زیاتر بکاتە سەر ئیسلام و پیرۆزیەکانی.

## سێیەم: ئازادی بیروڕادەربڕین، یان ئازادی کوفر کردن؟

شتێکی ڕوون وئاشکرایە ئەوانەی بانگەشەی ئازادی ڕەها دەکەن، هەرگیز نەیان ویستووە وناشیانەوێت ئازادی تەواوی بیروڕاو بۆچوون دەربڕین هەبێت، چونکە ئەوان لەوە دڵنیان کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەڕووی دیالۆگیشەوە هەروەکو ڕوەکانی تر هاوشان و هاوشێوەو بەربەرەکانیّ کەری نیەو، هەر ئەوان لەوەشدا شکست دەخۆن، بەڵکو ئەوان دەیانەوێت ئازادی کوفر کردن بوونی هەبێت و پەرەشی پیّ بدرێت، هەر کەسێکیش لەو بارەیەوە ڕەخنەیان لیّ بگرێت، بەدوژمنی ئازادی لەقەڵەم دەدەن و، تەنانەت ئەگەر کەسێك کار بۆ جێبەجێکردنی حوکمێکی پەروەردگار بکات، ئەوا دەست بەجیّ بە تەکفیری و توندڕەوو تیرۆریست ناوزەدی دەکەن.

خوازیارین توانیبێتمان ئەوەتا پیّ ڕابگەیەنین،ڕۆژئاواییەکان لەواتای تەواوی ئازادی نەگەیشتوون وخەڵکیش بەو تێگەیشتنە هەڵەیەی خۆیان سەر لێشێواو دەکەن،یاخود لەواتای تەواوی ئازادی گەیشتون و دەیانەوێت وەها خۆیان نمایش بکەن کە لە ئازادی نازانن تا بەو شێوەیە نەخشەکانیان لە دژی ئیسلام و موسڵمانان جیّ بە جیّ بکەن! ڕۆژ ئاواییەکان تەنانەت ڕێزیش لەمافی خەڵکی لە سەربەست بوونی پەرستشەکانیاندا ناگرن، لە هەمانکاتیشدا بۆخۆیانی ڕەوا دەبینن بەڕاست وچەوتدا هێرشی نابەجیّ بکەنە سەر ئیسلام وپیرۆزیەکانی و، درووشم وشیعارەکانی و، قسەی نابەجیّ بەپێغەمبەرە نازدارەکەشمان (ﷺ) بڵێن.

بەڵیّ پێویستە موسوڵمانان ئەوە بزانن کەتاکە ئازادیەك لەڕۆژئاوادا برەوی هەبێت وڕێگەی بۆ فراوان کرابێت، ئەو ئازادیەیە کە بۆ هێرشکردنە سەر ئیسلام وپێغەمبەرە نازدارەکەی (ﷺ) تەرخانکراوە، پێویستە ئەوەش بۆ هەموان ڕوون بکرێتەوە و موسوڵمانان گێلانە نەکەونە شوێنی ڕۆژئاوای دژ بەئاینیان.

# سەرخستنی پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ)

# لە هەنگاوی یەکەمدا چەندین پڕۆژەی جۆراوجۆر

لێرەدا هەوڵ دەدەین خوێندنەوەیەکی شیکاری بکەین بۆ ئەو دەست درێژیانەی دەکرێنە سەر پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) و باسی چۆنیەتی بەرگری لێکردنی بکەین.

لای هەموان ڕون و ئاشکرایە بەردەوام بێباوەڕان لەسەر ئەو ڕەوتەیان بەردەوامن و،ماندوونابن لە سوکایەتی کردن بە ئاین وپێغەمبەرەکەمان (ﷺ)،ئەمەش شتێکی نوێ نیەو، کردەوە قێزەون و نەشیاوەکانی دانیمارکیش سەرەتاو کۆتا ڕووداوی لەو بابەتە نین، ئێمە لە حیکمەتی (ئارام–صبر) ی زۆری پەروەردگارمان تێناگەین ، ڕاستە ئەو وێنانەی دانیمارك بۆ سەردڵی موسڵمانان شتێکی قورس وکارەساتێکی ناخۆش بوون، بەلاّم لەهەمانکاتدا ئەو ڕووداوە، جیهانی ڕۆژئاوای هەژاند وخەڵکی دوچاری شۆكو سەرسام بوون کرد، کاتێك حەماسەت و جورئەت وجوامێری موسوڵمانانیان لەهەمولایەکەوە بینی کە بەوشێوە بەر فراوانە بەرگری لە ئاینی خۆیان و پێغەمبەری نازداریان (ﷺ) دەکەن، تەواو واق وڕمان و تووشی بەخۆداچوونەوە بوون.

سەرەتای بێڕێزی نواندنەکان لە ٢٠٠٥/٩/٣٠دا دەستیان پێکرد،ئەوەش کاتێك بوو، کە دوانزە وێنەی کاریکاتێری لەلایەن ڕۆژنامەی (ئەلیولاند بوسگن) ی دانیمارکیەوە بلاّو کرانەوە، هەمان کات سەرنووسەری ڕۆژنامەکە، بابەتێکی دەربارەی وێنەکان نووسی بوو، داوای لەموسڵمانان کردبوو زۆر بەئاسایی مامەڵە لەگەڵ وێنەکاندا بکەن!

ناو براو بلاّوکردنەوەی وێنە کاریکاتێرەکانی بەبەشێك لەسەرەتاکانی دیموکراسی وەسف دەکرد و دەناساند.

لەپاش چەندین دانیشتن وبیروڕاگۆڕینەوەی موسڵمانان لەناوخۆیاندا، سەرەنجام گەیشتنە ئەو بڕیارەی کە کۆبوونەوەیەك سازبکرێت و گەورە بانگخوازانی دانیمارك و

بەرپرسانی موسڵمانی دانیشتووی ئەو وڵاتە بۆ ئەو کۆبوونەوەیە بانگهێشت بکرێن و وتووێژێکی تێروتەسەل لەو بارەیەوە بکرێت.

پاشان لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن ئیدی لە ئاست ئەو هێرشە ناڕەوایانە بێدەنگی هەڵنەبژێرن و بەرپەرچی هەر جۆرە هێرش و سووکایەتیەك بدەنەوە،هەمان کات پێویست بوو موسڵمانانیش پەرچەکردارێکی وەها نەنوێنن بیانوو بەدەست خەڵکی ترەوە بدات هەتا هێرشی ناڕەوای تر بکەنە سەر پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ).

دەبوو موسڵمانانی دانیمارکیش لەو ڕوانگەیەوە خۆیان بەنوێنەری موسڵمانانی جیهان بزانن و، لەو ساتە وەختەدا گەورەترین ئەرکی مێژووییان کەوتبووە سەرشان و، پێویست بوو زۆر بەچاکی کاروبارەکان لەوبارەیەوە ڕاپەڕێنن سوپاس بۆ خوای گەورە هەرواش دەرچوو.

## مۆژدەکانی سەرکەوتن:

سەرەتا لەهەمولایەکی جیهانەوە موسڵمانانی جیهان بەشێوەیەکی بەرفراوان و وەك بوومەلەرزە کەوتنەخۆ، لەپێناوی بەرگری کردن لەسەروەری مرۆڤایەتی (ﷺ) هەریەکەو بەپێی توانا کەوتە سەرشەقام و شار و وڵاتانیان خرۆشاند و بە نووسینی ووتار و پەرتووك وسەڵاوات لەسەردانی پشتگیری خۆیان دووپات کردەوە.

بێڕێزی نواندنەکانی ٢٠٠٥/٩/٣٠ لەکۆتا هەینی مانگی شەعباندا ڕوویان داو، لە هەینی یەکەمی مانگی ڕەمەزاندا موسڵمانانی جیهان بەپەرۆشەوە کەوتنە بەرگری و،پشتگیری هەمەلایەنەیان بۆ سەروەری مرۆڤایەتی وسەردارمان (ﷺ) دووپات کردەوە، ئیدی پاش ئەو هەموو ڕێپێوان و بەرگری یە بەرفراوانە ڕۆژنامە نەفرین کراوەکەی دانیمارك بۆی دەرکەوت، موسڵمانان هۆشیارن ولەئاستی هیچ هێرش وسووکایەتیەك بە ئاین و پێغەمبەرەکەیان (ﷺ) بێدەنگ نابن!

هەر هەمان ڕۆژو پاش دوو کاتژمێر هێندە نامەی سەرکۆنە بۆ پشتیوانی کردنی ئازیزو سەروەرمان (ﷺ) ئاراستەی بەریدی ڕۆژنامەکە کران،بەشێوەیەك کە کاربەدەست و بەڕێوەبەرانی ڕۆژنامەکەیان هەراسان کردو تووشی شۆك هاتن!

پاشان پێشنیارکرا چەندین نموونەی ناڕەزایی پیشان دان ئەنجام بدرێن، هەتا بۆ ڕۆژنامەکەو خەڵك وکار بەدەستانی دانیمارك دەربکەوێت کەموسڵمانان بەشێوەیەکی بەرفراوان و بەتوندی لێیان تووڕەن.

لەو ڕوانگەوەیەوە واژوو کۆکردنەوە نموونەیەکی بەرجەستەی ناڕەزاییەکان بوون، کە بەمەش زۆرترین ئیمزاو پەنجەمۆر کۆکرانەوەو، ڕادەستی لیژنەی پسپۆڕو تایبەت بەو کارە کران، هەتا لە دادگادا وەك پاڵپشتی یاسایی بەکار بهێنرێن و،هەمان کات بۆ کاراکردنی کێشەکە چەندین لایەنی ڕەسمی سەردانی وەزیری ڕۆشنبیری و گەورە بەرپرسانی دانیمارك و پەرلەمانیان کرد،هەروەها سەردانی سەرجەم باڵیۆزەکانی جیهانی ئیسلامیان لەوڵاتی دانیمارك کرد.

کات بەخێرایی تێدەپەڕی و ڕۆژنامە نەفرین لێ کراوەکەش بەردەوام پێداگری لەسەر کارەکەی دەکرد وئامادەی پۆزش و داوای لێبوردن کردن نەبوو، هەمان کات لەسەر پێگەی ئەلیکترۆنی خۆی بەشێکی نوێی کردەوە بەناوونیشانی ( سەیری وێنەکانی موحەممەد) بکەن! دووبارە لەوێشدا وێنەکانیان نمایش دەکردنەوەو، هەمان کات بەیاننامەیەکیان دەرکردو،ئەو وێنانەیان بە بەشێك لە ئازادی ڕادەربڕین لە قەڵەم دا.

بە دڵنیاییەوە حکومەتی دانیمارکی پشتیوانی لەڕۆژنامەکە دەکردو، ئەوانیش لەبەر ئەوپشتگیریەی حکومەت بۆیان! بەردەوام لەوکارە چەوتەیان پێداگرییان دەکرد.

هەروەها ئەم داوایە لەلایەن باڵوێزانی وڵاتانی ئیسلامیەوە ئاراستەی حکومەتی دانیمارکی کرا، بەڵام بەرپەرچ درانەوەو،لە بەرانبەردا حکومەتی دانیمارکی ڕایگەیاند کە بە هیچ شێوەیەك دەست بەرداری ئازادی ڕادەربڕین نابن.....

سەرەنجام هەموو ئاماژەکان بەو ئاراستەیەدا بوون کەئەوان دەیان ویست موسڵمانان ئەو بارودۆخە قەبووڵ بکەن و،دەیان ویست بەبیانووی دیموکراسی و ئازادی ڕادەربڕینەوە، ژەهری لەمێژینەی خۆیان دژی ئیسلام و پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) بڕێژن.

بێگومان بارودۆخەکەو هەڵوێستە نەشیاوەکانیان، لەسەرمانی پێویست کرد بەشێوەیەکی تۆکمەترو گشتگیرتر لیژنەکەمان(اللجنة الاوروبية لنصرةالخيرالبرية) بکەوێتە خۆی بۆ ڕاپی کردنی کارەکان، پاشان بەیانێکمان دەرکرد و کۆپیەکمان ئاڕاستەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی دانیمارکی کرد، ئیتر لەبەرانبەر بێهەڵوێستی حکومەتی دانیمارک‌و خۆ گێل کردنیان لەبارودۆخەکە بڕیارماندا جیهانی ئیسلامی بەشێوەیەکی فەرمی لەکێشەکە ئاگادار بکەینەوەو، داوای هەڵوێستی موسڵمانانی جیهان بکەین و، بۆ ئەم مەبەستەش دووەم بەیاننامەی فەرمی خۆمان ئاراستەی جیهانی ئیسلامی کردو،تیایدا بەدرێژی ڕووداوی سووکایەتی و کاریکاتێرەکانمان بۆ خەڵکی جیهان ئاشکرا کردو، داوای هەڵوێستیشمان لە جیهانی ئیسلامی کرد.

بەدڵنیاییەوە هەریەکەو لەلای خۆیەوە کاریگەری خۆی لەو بوارەدا هەبووە بۆ ئیدانەکردن و ڕیسواکردنی ئەوکارە نامرۆڤانەیەی ڕۆژنامە نووسانی دانیمارک.

هەمان کات دەستمان کرد بە ڕەوانە کردنی نوێنەرانمان بۆ وڵاتانی ئیسلامی،

ئیدی لەهەموو سەردانەکانماندا بۆ وڵاتانی ئیسلامی داوای هاوکاریمان بۆ وەستاندنی ئەو بێڕێزیانە دەکرد.

سوپاس بۆ خوای گەورە پاش خێراکردن و کاراکردنی ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانمان، لەهەموو جیهانەوە موسڵمانان پشتگیری خۆیان خستە پاڵمان و کەوتنە وەڵامدانەوەی داواکەی ئێمە وپشتگیری کردنی ئازیزمان (ﷺ) و، ئیدانە کردنی ئەو ئیهانەو هێرشە ناڕەوایانەی ڕۆژنامە نووسانی دانیمارک.

بەمەش گەورەترین سەرکەوتن و پشتیوانیمان بۆ ئەو سەروەرە ئازیزەمان (ﷺ) لەهەموو لایەکی جیهاندا بەدەست هێنا.

پێویستە ئاماژەش بەوە بدەین وێنەکاریکاتێرەکان هۆکاربوون هەتا چەندین کەسایەتی و وزەی شاراوەی جیهانی ئیسلامی دەربکەون و لەو ڕووەوە چەندین داهێنانی زانستی نوێ پیشان دران و، موسڵمانان بەپێی تواناکانیان لەو بارەوە هەڵوێستی جوامێرانەی خۆیان پیشاندا، خوای گەورە پاداشتی بەخێری هەمولایەک بداتەوە.

## ئەو دەستکەوتانەی کە پێویستە ئاماژەیان پێ بکەین:

بەداخەوە هەندێ کەسی دەروون نەخۆش کەسۆز وخۆشەویستییان بۆ پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) نیە، بەبێ نرخ و بە چاوێکی کەمەوە تەماشای کاردانەوە و پشتیوانیەکانی موسڵمانان وبەرگری کردنەکەیان دەکرد. ئەوانە بەردەوام بەشە خاڵیەکەی کاسەکە دەبینن، لەبەرئەوە بەردەوام ڕەخنە لە پشتیوانی وکاردانەوەی موسڵمانان دەگرن،تەنانەت خەڵکیان لە پشتگیری و یارمەتیدانی ئەو پرۆسەی بەرگری لە پێغەمبەر(ﷺ) کردنە سارد دەکردەوە، بە شێوەیەك خۆیان گومانیان لەهەموو شتێك هەبوو و بەزمانی خۆیان دەیان ووت: ئەوەندە ماندوو بوون؟...بەچی گەیشتن؟...چیتان بەدەست هێنا؟

ئێمەش دەڵێین: ئەوەی لەتوانای موسڵماناندا بوو کردیان بەئاڕاستەی سەرخستن وپشتگیری کردنی پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) ئێمە ئەگەر هیچمان نەکردبێت، ئەوەندەمان کردووە کە لە ڕۆژی دوایی ڕوومان بێت بچینە خزمەتی ئەو ئازیزەمان (ﷺ)، ئەوەی پێویست و ئەرکی سەرشانمان بوو بەرانبەر بە پێغەمبەرەکەمان (ﷺ) ئەنجاممان داو، گەورەترین پەیاممان ئاراستەی جیهان کرد وپێمان ووتن: ئێمە

ئوممەتێکین پێغەمبەرە نازدارەکەمان (ﷺ) خۆشدەوێت و،لەوپێناوەشدا خۆمان و سەروەت و ماڵ وسامانمان بەخت دەکەین!

بەجیهانمان ووت: تەنانەت پێغەمبەرەکەمان (ﷺ) لەگیانی خۆشمان خۆشتر دەوێت. بەڵێ ئەم هەما هەنگی وپێکەوە بوونەی جیهانی ئیسلامی، ڕۆژئاوای دووچاری شۆك کرد! ئیدی ئایا هیچمان نەکردووە!؟

## چەند موژدەیەکی دڵخۆشکەر:

ڕۆژنامەیەکی(متدين)ـی دانیمارکی بابەتێکی بڵاوکردەوەو، تیایدا ڕەخنەی توندی ئاراستەی قەشەکان کرد، چونکە ئەوان نەیان توانیبوو هاو وێنەی موسڵمانان نوێنەرو گەیەنەری ڕاستەقینەی ئاینەکەیان بن، ڕاپۆرتەکە باس لەوەش دەکات کەموسڵمانان لە دانیمارکدا نموونەیەکی جوانن و بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش و جوان نوێنەرایەتی ئاینەکەیان دەکەن و، هەمان کات ڕەخنە لە قەشەکان دەگرێت ، هەروەها ئاماژەی بەوە کردووە کەتەنها لەماوەی دو ساڵدا لە پاش (وێنەکاریکاتێرەکان) حەوت هەزار کەس لەووڵاتی دانیمارکدا هاتوونەتە سەر ئاینی پیرۆزی ئیسلام و موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاندووە، کە زۆربەیان تەمەنیان لە خوار تەمەنی سی ساڵیەوە بووە، ئەمە لەکاتێکدایە قەشەکان لەماوەی ئەو حەوت ساڵەدا تەنهاحەوت سەد کەسیان هێناوەتە ناو ئاینی نەسرانیەوە، ئەوانیش لە ئاینە جیاوازەکانی تری جگە لە ئیسلامەوە هاتبوون.

پێویستە هەرگیز واگومان نەبەین کە دوژمنان کاریگەر نەبوون بەهەڵوێست و کاردانەوەی موسڵمانان، سوێند بە خوای گەورە ئەم ڕووداوانە زۆر کاریگەرییان کردە سەر دوژمنان و گەورەترین سەرکەوتنیان بۆ ئەم ئیسلامە بەدەست هێنا، کاتێك ئەو هەموو حەماسەت و گەرم و گوڕیەی موسڵمانان بینرا، هەموو جیهان سەرسام بوون و واقیان وڕما!

چونکە هەموو ئەو دەنگ و ڕێپێوان و بەرگریە دژی چەند وێنەیەك کە دژی تاکە کەسێك درووستکرابوون ئەنجام دەدران، ئەویش پێغەمبەرێکە (ﷺ) و چواردە سەدەیە وەفاتی فەرمووە.

ڕۆژئاواییەکان لەسەرکەوتنی ئیسلام دەترسن لەبەر ئەوە ئامادە نین دان بەئیسلامدا بنێن، وێنەکاریکاتێرەکان جارێکی تر موسڵمانانی جیهانی بەئاگا هێنایەوە بەوەی نابێت شەرم لەئیسلام بوونی خۆیان بکەن!

مایەی سەر سوڕمانە لەپاش ئەو ڕووداوانە لە زۆربەی هەرە زۆری ئاهەنگە گەورەکانی دانیمارکدا تەنها دیارییەك کە دابەش دەکرا، قورئانی پیرۆزبوو!

هەروەها هەر لەدرێژەی کاروچالاکیەکانی سەرخستنی پێغەمبەری نازدارماندا (ﷺ) چەندین نووسەری بەتوانا هاتوونەتە مەیدانی کارکردنەوەو،بە نووسینەکانیان بەرگری لەو سەروەری مرۆڤایەتیە (ﷺ) دەکەن و ،هەمان کات پاش ئەو ڕووداوە هونەرمەندە ئیسلامیەکان ژمارەیان زۆر لەزیادبووندایە، لەو بوارەدا بە هونەر و کارەکانیان خۆشەویستی و بەرگرییان بۆ پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) دووپات دەکەنەوە.

بەکورتی لەپاش وێنە کاریکاتێرەکانەوە، هەموو موسڵمانێك بەپێی توانای خۆی، خۆی لەئاستی پشتیوانی و بەرگری لەپێغەمبەرەکەی (ﷺ) بە بەرپرسیاردەزانێت و، هەوڵی پشتیوانی وسەرخستنی ئاینەکەی دەدات.

## ئەو نهێنیە چی بوو کە جیهانی هەژاند!؟

لە ڕاستیدا ئەمە پرسیارێکی زۆر گرنگە وبەردەوام سەرسامی کردووین، چونکە بەزیندوویی و بە مردوویی گاڵتە بەپێغەمبەرمان (ﷺ) کراوە، بەر لە دانیمارك و لە پاش ئەویش هەر یەکە لە سوید وپاپای ڤاتیکان ئەو بێڕێزیەیان بەرانبەر بە ئازیزمان (ﷺ) ئەنجام داوە.

بینیمان لەدانیمارکدا چەندین جار بێڕیزی بەرانبەر سەروەرمان (ﷺ) کرا، ئەوە (عجوز شمطاء) ی ڕەگەز پەرستی دانیمارکیە، کەدروشمی هەڵمەتی پڕوپاگەندەی هەڵبژاردنەکەی بەرز کردنەوەی وێنەیەکی کاریکاتێری پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) بوو، ناوبراو دەی ووت: ئازادی بیروڕا مافێکی خۆمانە و لێی پاشگەز نابینەوە!

من دەپرسم بۆچی بۆ بێڕێزی نواندنەکانی پێش دانیمارك و دوای دانیمارکیش جیهان بەو شێوەیەی دانیمارك نەهەژا؟ بەدڵنیاییەوە ئەمەش یەکێکە لەحیکمەتەکانی پەروەردگارمان، چونکە ئیسلام یەك ئیسلامە وپێغەمبەری نازداریش هەر ئەو موحەممەدەیە (ﷺ) ،بەلام وەك پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) فەرموویەتی: خوای گەورە لەسەرەتای هەموو سەدەیەکدا کەسێك دەنێرێت هەتا ئاینداری لەناو خەڵکیدا ببوژێنێتەوە و ببێتە هۆی هێز وپێزو جوامێری موسڵمانان.

ئەم جارە وێنە کاریکاتێرەکان کە ئەوان بەنیازی بچووککردنەوە ئەنجامیان دابوون، بوونە هۆکاری ئەوەی خوای گەورە و بەدەسەلات، گەورەیی پێغەمبەرەکەمان (ﷺ) لەدڵی موسڵماناندا بۆ هەموو جیهان بسەلمێنێت و، ئەو وێنانە بۆ ئوممەتی ئیسلامی وموسڵمانان بوونە تاقیکردنەوەو وانەیەکی گرنگ ، هەتا هەر یەکەمان ڕاستیەتی خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) لەدڵ ودەروونیدا بەکردار بسەلمێنێت.

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا ئەم ڕووداوە هەموو جیهانی هەژاند و هەمان کات بووە هۆکاری سەرلەنوێ بەخۆداچوونەوە و گەشەسەندنەوەی بیروباوەڕی موسوڵمانان و بەردەوام بوونی زیاتر لەسەر بانگەوازی خوایی لەهەموولایەکی ئەم گۆی زەویەو، جێگیر بوونەوەی ئەو خۆشەویستیە لەناو دڵ ودەروونی موسڵماناندا، ئەوەتا سەرنووسەری یەکێك لەڕۆژنامە خراپە ڕۆژئاواییەکان دەڵێت: موسڵمانان کاردانەوەیەکی وەهایان نواند، بووە وانەیەکی گرنگ وگەورە بۆ هەموو خەڵکانی جیهانو، هەمان کات وەهایان کرد و بە هۆیەوە چەندین ساڵی زۆر لە ئامانجو مەرامەکانی خۆمان پاشەکشەمان کرد، ئیتر وەچەکانمان جورئەتی ئەوە ناکەن بەناوی

ئازادی ڕادەربڕینەوە سووکایەتی بەپیرۆزیەکانی موسڵمانان بکەن! ئەو ڕۆژنامەنووسە ئەم ڕاستیەی لەکاتی هەڵمەتی سەرخستنی ئازیزماندا (ﷺ) ئاشکرا کرد.

## بەشداری بەرچاوی موسوڵمانان لەو سەرکەوتنە مەزنەدا:

مایەی دڵخۆشی وشانازیە هەموو ئوممەت بەیەك دەنگ بەشداری لە سەرخستنی پرۆژەی سەرخستنی پێغەمبەری نازدارماندا (ﷺ) کرد، لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا وولات نەما لیژنەی سەرخستنی پێغەمبەری ئازیزمانی (ﷺ) تێدا نەبێت، بەجیاوازی تەمەنەوە هەموو موسڵمانانی جیهان بەشداریان لەو پرۆسە گەورە و شکۆدارەدا کرد.

ڕێژەیەکی کەمی موسڵمانان و هەریەکە بە هێنانەوەی بیانوویەك یان هۆکارێکی تایبەتی خۆیان بەشدارییان لەو پرۆسە گەورەو گرنگەدا نەکرد، هەمان کات هەڵمەتەکانی سەرخستنی پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) هەمەچەشن وجۆراو جۆربوون،هەرموسوڵمانێك بەپێی پسپۆری و شارەزایی خۆی لەبوارێکدا بەشداری کرد، لێرەدا هەندێك نموونە لەهەڵمەتە جۆراو جۆرەکانی سەرخستنی پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) باس دەکەین:

## بەیاننامە ومەقالات:

پاش بڵاو بوونەوەی وێنەکان بە تێپەڕینی کات و،لەدوای ئەوەی بابەتەکە بەموسڵمانان گەیشت، نزیکەی پەنجا بەیاننامە لەلایەن ڕێکخراوە و کۆمەڵە و دامەزراوەکانەوە دەرکران و بلأوکرانەوە،هەروەها چەندین ناوەندی فەرمی ولأتانیش لەو ڕووەوە بەیاننامەی پشتگیرییان بۆ سەرخستنی پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) دەرکرد وبلأویان کردەوە.

ئەوەی مایەی سەرسوڕمان وجێگەی دەست خۆشیە ئەوەیە، لەو ماوەیەدا هەوڵ وکۆششی (تاکە کەسی) زۆر گەورە بۆ سەرخستنی پرۆسەی بەرگری کردن لە ئازیزمان (ﷺ) دەبینران، هەر یەکە لەئاستی خۆیەوە بابەتێك یان بەیاننامەیەکی بۆ پشتگیری پرۆسەکە بەرزکردبوەوە، ئەو بەیاننامە و نووسینانەش لەپاش وەرگێڕانیان بۆ سەر

زمانی دانیمارکی ڕاستەوخۆ ئاراستەی وەزارەتی دەرەوە یان دامەزراوە فەرمیە کانی تری دانیمارك دەکران، خوای گەورە پاداشتی بەخێری هەموان بداتەوە بمان خاتە بەر تکای پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) انشا الله.

## شیعر وهۆنراوە

| | |
|---|---|
| هجوت محمدا فــاجبت عنه | وعنــدالله في ذاك الجـزاء |
| اتهجوه ولست له بكــــف | فشركـما لخيركما الـفداء |
| هجوت مباركـا برا حنيفا | امين الله شيمته الوفــاء |
| فـمن يهجو رسول الله مـنكم | ويمدحــه وينصـره ســواء |
| فـــان ابي ووالـــده وعرضي | لعرض محمد منكم وقـــاء |

ئەوە لە چاوی شیعرەوە سەرچاوەی گرتووە، بۆ بەرگری کردن لەپێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) و ستایش کردنی، ئەمە نموونەی شیعرەکانی شاعیرەکەی پێغەمبەری ئازیزمانە (ﷺ)، کە حەسسانی کوری سابتە، سوپاس بۆ خوای گەورە لەناو ئەم ئوممەتەدا و لە هەموو سەردەم و لەناو هەموو گەلانی جیهاندا، کەسانێکی زۆر هەن کە هەمان ڕێچکەی حەسسانیان گرتووەتەبەر.

بەڵێ، ڕاستەوخۆو پاش بڵاوبوونەوەی وێنەکاریکاتێرەکان، دەیان و سەدان شاعیری گەورەی جیهان لەهەموو لایەکی دونیاوە ، بەشیعرو هۆنراوەکانیان پشتگیری خۆیان بۆ ئەو پێغەمبەرە نازدارە (ﷺ) نوێ کردەوە.

کوردستانە جوانەکەی ئێمەش وەك چۆن لەخەبات و ئیسلامەتی و پێشکەش کردنی سەلاحەدینەکاندا پێشەنگ بووە، بەهەمان شێوەش بەچەشنی حەسسان و پاش بڵاو بوونەوەی دەنگۆی وێنە کاریکاتێرەکان، چەندین شاعیری خواناس و تامەزرۆی دیداری فەخری کائینات حەزرەتی موحەممەدولموستەفا (ﷺ) بەشیعرو هۆنراوەکانیان پشتیوانی و سۆزی خۆیان بۆ ئەو ئازیزە دووپات کردەوە و خەڵکی خەواڵوویان بەشیعرەکانیان بێدار کردەوە،ئەوەتا مامۆستای بەڕێزو شاعیری خواناس مامۆستا

(یاوەر هـەورامی) خـوای گـەورە تەمـەنی بەبەرەکەت تربکات، حەسـسان ئاسـا دێتـە هۆنینەوەی هۆنراوە و دەڵێت:

## بەجێم مەهێڵن

بەجێم مـــــەهێڵن بۆ زیـــارەت دێم
ئەویندارێکم دەمێکـــە لــــــە ڕێم
عاشق بە کـەعبەو فەخـــری ئەنبیام
بۆ دیدەنـی دێم یاران بــە تەنهـــام
توێـــشوی سەفەرم لــە دەسم داوە
خۆشـــەویستـیــە ئـەوەی پێم ماوە
بەجێم مــــەهێڵن ڕێگە دەرنـــاکــەم
ئوممەتی ئـەوم ئەمن هــەرچی هــەم
پێغەمبـــەرێکــە ڕێنیشــانـــدەرە
عـــارەقـــی گۆنای میسك و عـەنبەرە
ســـــەرکردەیەکـــی ئـــازاو بـــوێرە
عاشق بەڕووی بوون مانگ و ئەستێرە
منیش کە کوردم وەك کـاوان هاتووم
عـــــەودالّی سیماو ڕێبازەکـــەی بووم
هـــاتووم بەو بۆنە عەنبەر ناگات پێی
گشتی هــــەڕاج بکەم ئەو بخەمە جێی
هاتووم لــە ڕەوزەت سەلام بکەم لێت
بڵێم کوردستـــان عـــاشق بووە پێت
گەرچی وەك بیلال مانگی هەڵهاتووم
زۆرم خۆش دەوێی لە حوبت ڕۆچووم
ئەو شـــەوەی بیـــلال کە گـــەڕایەوە

لە مزگەوت نەبووی بــۆت بووڕایەوە
قــوربان من بیلال نیـم بەجێت بهێڵم
کــاوانی کــوردیم بــە شــوێنتا وێڵم
زەیدم گــیانی خۆم دەکــەمە فیدات
لە تائف دەبمە قــەڵــغان بۆ بــالآت
بێ ئەدەبـــیە یـــاری غـــارت بم
وەفـــادارەکـــەی ڕێی هـــەوارت بم
من ڕێبوارەکــەی خــاکی کوردانم
نیشتەجێی چیام هاوڕێی ســـەلـمانم
کۆترێکم هاتووم بۆ دەرگـای غــارت
ببمە پـاســەوان سیمــاو ڕوخسارت
هــاتووم پــەیمانم نوێ بکـــەمـــەوە
لـــەم ڕێبــازەی تۆ ســـەر بنێمەوە

## کۆڕو سیمینارو خۆپیشاندانی هێمنانە:

یەکێکی تر لەو هۆکارانەی بۆ سەرخستنی پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) بـەکارهێنرا، بەستنی کۆڕو کۆبوونـەوە بـوو لـە زۆربـەی هـەرە زۆری شـارو شارۆچکەکانی وڵاتـانی ئیسلامیداو، تیایاندا زانایانی ئیسلامی و کەسانی پسپۆڕ بانگهێشت دەکران و وتاریـان تێدا دەخوێندەوە، هەروەها لەچوار چێوەی کارەکـانی سەرخـستن وپـشتیوانی کردنـی پێغەمبەری نازدارمانـدا (ﷺ) لـە زۆربـەی وڵاتـانی ئیـسلامی و ڕۆژئـاوادا، دەسـت کـرا بەچـاپکردنی هــەزاران نەشـرەو تـابلۆی ڕەنـگ ڕەنگـاو ولافیتـە و لەشوێنەگـشتیەکاندا بەشێوەیەکی بەرچـاو هەڵدەواسـران، کەهــەموویان پـشتگیری وپـشتیوانی پێغەمبــەری نازدارمانیان (ﷺ) دووپات دەکردەوە.

هەروەها لە ڕۆژئاوادا ئەم ڕێگەیە بەکار هێنرا هەتا ژیانی ئازیزمان(ﷺ) وەك ئەوەی کە هەیە بگەیەنرێتە ڕۆژئاواییەکان و، بەرپەرچی زۆربەی ئەو هەڵبەستە ناڕەواو گومانە خراپانەی کە دەکرانە سەر پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) پێ دەدرایەوە، خۆپیشاندانی هێمنانەش هۆکارێکی زۆر گرنگ بوو، ئەو ڕاستیەی بە گوێی جیهاندا داو، پێی ڕاگەیاندن: کەئیسلام ئاینێکەو حەزی لە ئاشتی و هێمنی و پێکەوە ژیان و خۆشگوزەرانیەو، هەروەها ئەمەش پووچەڵکەرەوەی ئەو بانگەشە ناڕەوایانەی دوژمنان بوو بەوەی دەیان ووت: ئیسلام ئاینی توندو تیژی وتیرۆرو تۆقاندنە.

## پچڕاندنی پەیوەندی لەگەڵ دانیمارك دا:

ئەمە یەکێك بوو لەو داهێنانە نوێیانەی کە زۆربەمان بەهۆیەوە دووچاری سەرسام بوون هاتین وەك هۆکارێکی نوێ بەکار هێنرا بۆ پشتیوانی کردن و سەرخستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەویش ئەوە بوو کە چەندین کۆمپانیاو دامەزراوەی ئابووری و وەبەرهێنەرەکان، بڕیاریان دا کە پەیوەندی ئابووری و بازرگانی خۆیان لەگەڵ دانیمارکدا بپچڕێنن، سەرباری ئەوەی کە زۆربەیان دووچاری زیانێکی کاتی و دونیایی هاتن و کردیاننە قوربانی خۆشەویستەکەیان (ﷺ) ! هەمان کات حکومەتی دانیمارکی لە ئەنجامی بێ دەنگ بوونی لەو بێ ڕێزییانەی ڕۆژنامەکە، دووچاری گەورەترین زیانی مادی بوویەوە کە لەو ڕووەوە چەندین کۆمپانیا پەیوەندیان پچڕان و، هەمان کات بەرهەم و شمەکەکانی دانیمارك لەزۆربەی وڵاتانی ئیسلامی دا ڕەت کرانەوەو، زۆرێك لە کۆمپانیا زەبەلاحەکانی دانیمارك لە وڵاتانی ئیسلامی دا دەرکران و بەهۆیەوە حکومەتی دانیمارك ڕووبەڕووی قەیران و کێشەیەکی دارایی گەورە بوویەوە، سەرباری ئەوەی کە چەندین وڵات ڕاستەوخۆ باڵوێزەکانی خۆیان کێشایەوەو پەیوەندییەکانیان پچڕاند.

## ڕێنمایی و ئاراستە کردن:

لەو ساتەداو لەگەڵ دەرکەوتنی لیژنەکانی سەرخستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دا بەردەوام هەواڵەکان لەو بارەوە پەخش دەکران، لەو میانەدا چەندین کەس ڕاستەوخۆ دەستیان کرد بە کردنەوەو درووست کردنی پاشکۆ لە ماڵپەڕە ئەلیکترۆنی و ڕۆژنامەکانیان دا، لەوپاشکۆیانەدا هەوڵیان دەدا تایبەت مەندی و سیفەتەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بخەنە ڕوو، هەمان کات بە بەڵگەی لۆژیکی بەرپەرچی سەرجەم ئەو درۆو بوختانانەیان دەدایەوە کە دوژمنان ئاڕاستەی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) کردووە، هەروەها وەك بەرچاو ڕۆشنی کۆمەڵێك هەنگاویان دیاری دەکرد، هەتا موسڵمانان بزانن چۆن بەشدار دەبن لە هەڵمەتەکانی سەرخستنی پێغەمبەری خوادا (ﷺ).

## نابێت ئەوەمان بیر بچێت کە گۆڤارو ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسەکانیش لەو ماوەدا ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبووەویش بە:

### دەرکردنی کتێب:

لەگەڵ ئەوەی ئەو ڕووداوە زۆر گەورە بوو، بەڵام بەداخەوە تا ئەو کاتە لە دانیمارك دا تەنها یەك کتێب بە زمانی دانیمارکی دەربارەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەبوو، هەمان کات ئێمە هەوڵ و کۆششی برا موسڵمانەکانی دانیمارك و بانگخوازەکان بەرز دەنرخێنین،هەوڵ و ماندوو بوونێکی زۆریان کێشاوە بۆ بڵاوکردنەوەی چەندین نەشرە دەربارەی ئیسلام ، هەروەها چاپکردن و وەرگێڕانی گوڵاوی سەرمۆری تایبەت بەژیانی پێغەمبەر(ﷺ) و هەمان کات چەندین کتێبی تریان سەبارەت بە یەکتاپەرستی و ناساندنی ئیسلام و قورئان بەچاپ گەیاندووە، پاش ڕووداوەکەش کۆمەڵێك هەنگاوی جددی نران بەئاراستەی چاپ کردنی چەند کتێبێك لەوانەش کتێبی (محمد رسول الله) وەرگێڕدرایە سەر زمانی دانیمارکی و کتێبی (مختصر فهم الاسلام) یش چاپ کرا، کە

زۆربەی کتێبەکان بەسەر سەرکردەو چینە ڕۆشنبیرەکان و بەرپرسەکان دا دابەش دەکران.

پاش ڕووداوەکە هەوڵ درا قورئانی پیرۆز وەرگێڕدرێتە سەر زمانی دانیمارکی و، هەمان کات لەبوارەکانی عەقیدەو هزر و بەرپەرچدانەوەی گومانەکانی سەردەم دا دەربارەی پێغەمبەر (ﷺ) چەندین کتێب چاپکران، ئەم کتێبانە دەتوانرێت سوودیان لێ وەربگیرێت بۆ بانگ کردنی خەڵك و تێگەیاندنیان لەئیسلام ، هەروەها ئەم کتێبانە بناغەیەکی زۆر بە نرخن بۆ پەروەردەکردنی وەچەکانی داهاتووی موسڵمانان لە دانیمارك دا.

## کەناڵە ئاسمانیەکان:

لێرەدا دەتوانین بە سەربەرزییەوە ئاماژە بەو هەوڵانە بکەین کە کەناڵە ئیسلامیە ئاسمانیەکان لەو ماوەیەدا پێی هەستان ، بەڕاستی ئەوان بناغەو هاوکارێکی پتەو بوون بەئاراستەی سەرخستنی کارەکانی لیژنەی سەرخستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و بە ئەنجام گەیاندنیان، چونکە کەناڵە ئاسمانیە بۆ خوا سوڵحاوەکان بەردەوام لە هەموو جیهان دا عەودالی کارێکی ئەو لیژنانە بوون و ڕاستەوخۆ کۆڕو سیمینارو خۆپیشاندانەکانیان پەخش دەکردو هەمان کات گەورەترین هەڵمەتیان دەست پێ کرد بۆ پێشکەش کردنی بەرنامە لەو ڕووەوە.

بەدڵنیاییەوە گرنگی دانی ئەم کەناڵانە بەڕووداوەکە خۆی لەخۆیدا کارێکی گرنگ و پیرۆزەو مایەی دەست خۆشی و بەرز نرخاندنە، هەمان کات پێویستە ئاماژە بەوە بدەین لەپاش بڵاوبوونەوەی وێنە کاریکاتێریەکانەوە، چەندین کەناڵی ئاسمانی دامەزراون کە ئامانجیان بەرگری کردن و سەرخستنی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، سوپاس بۆ خوای گەورە ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی ئەو کەناڵانە لەزیاد بووندایە.

پێویستە ئاماژە بەوەش بدەین کە ماڵپەڕە ئەلیکترۆنیەکانیش لەم ڕووەوە ڕۆڵی گەورەیان بینی و هەوڵێکی زۆریان دا بە ئاراستەی بەرپەرچ دانەوەی ئەو بوختانانەی کە لەدژی پێغەمبەر (ﷺ) هەڵبەستراون، مایەی دەست خۆشیە شان بەشانی ماڵپەڕە

ئیسلامیەکانیش چەندین ماڵپەڕی ئاسایی بە ئەرکی خۆیان دەزانی و بەرپرسانەو بەبێ ئەوەی کەس پێیان بڵێت، لەو ڕووەوە ڕۆڵێکی جوانیان نواند، خوای گەورە پاداشتیان بداتەوە.

نابێت ئەو ڕاستیەشمان بیر بچێت کە بەشداری کردن لە چالاکیەکانی سەرخستنی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)، شەرەفێکی گەورەیە بۆ ئەو کەسەی کە پێی هەڵدەستێت و هەروەك ئەمە لەسەر موسڵمانان پێویستە،بە دڵنیاییەوە ئەگەر ئێمەش بەرگری لەپێغەمبەر (ﷺ) نەکەین ئەوا پەروەردگار بۆ خۆی بەرگری لێ دەکات و لەناوبەری ئەو کەسانەیە کە گاڵتە بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەکەن.

بێ گومان ئێمەش تەنها ئەوەندەمان لەسەرە کار بۆ سەر خستنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بکەین، بەپێچەوانەوە ئەگەر بێ هەڵوێست بین و لە هەڵمەتەکانی سەرخستنی پێغەمبەردا (ﷺ) کەلەبەرێك نەگرین، ئەوا لە ڕۆژی دوایی دا لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەکرێت، هەمووانیش لەو ڕووەوە بەرپرسیارین و لەپاشەڕۆژدا پەروەردگار پرسیارمان لێ دەکات کە لە دونیادا چ هەوڵێکمان داوە بۆ سەر خستنی ئاین و پێغەمبەرەکەی (ﷺ).

مایەی دڵخۆشییە کە زۆربەی هەرە زۆری ئوممەتەکەمان خۆیان بە بەرپرسیار دەزانن بەرامبەر پێغەمبەر (ﷺ) و ئاینەکەیان، ئەم ڕاستەقینەیەش لە سەرەتای هەڵمەتەکانی سەرخستنی پێغەمبەرەوە زۆر بەچاکی دەرکەوت، هەر موسڵمانەو ڕێگاو شێوازێکی تایبەتی خۆی بەکار دەهێنا بۆ پشتگیری کردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، دوژمنان دەڵێن لە ئیسلام دا ئازادی نییە، بەدڵنیاییەوە ئەمە گەورەترین ئازادییە کە هەر موسڵمانەو لەئاستی خۆی دا خۆی بە بەرپرس دەزانی بەرامبەر ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) و بەبێ ئەوەی کەس زۆری لێ بکات یاخود فەرمانی پێ بدات، بەبێ ئەوەی پاداشتێکی دونیایی وەربگرێت، خۆ بەخشانە دەهات بەپێی تواناو پسپۆری خۆی بەشداری دەکرد لە هەڵمەتەکانی سەرخستنی پێغەمەبەردا (ﷺ)، بەڕاستی ئەم سۆزو شەوقەی موسڵمانان بۆ پێغەمبەرەکەیان (ﷺ) هەمووانی دڵخۆش کردو دوژمنانیشی دووچاری شۆك و ڕیسوایی کرد.

## هەمووان پێکەوە بەرەو بەرنامەیەکی شەرعی بەردەوام بۆ بەرگری کردن لە پێغەمبەری خوا (ﷺ):

پێویستە ڕووداوی وێنە کاریکاتێریەکان بۆ ئێمەی موسڵمان ببنە وانەیەکی گرنگ، لەو ڕووانگەوەو بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕووداوی چاوەڕوانکراوی لەو شێوەیە، پێویستە موسڵمانان زیاتر یەکگرتوو و یەکدەنگ بن و بەرنامەی تۆکمە بە هاوبەش دابڕێژن، هەتا لەداهاتوودا زیاتر بەر بەم ڕووداوانە بگیرێت و لەو ڕووەوە دەکرێت کۆمەڵێك دەزگاو دامەزراوە دابمەزرێنرێت، پێویستە خەڵکی پسپۆڕو شارەزا سەرپەرشتیان بکەن و، هەمان کات دەبێت بانگخوازانی ئەم ئاینە زیاتر هەوڵ بدەن بۆ ناساندنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڕۆژئاواییەکان و بەرپەرچی سەرجەم ئەو درۆو گومان و بوختانانە بدەنەوە کە دژی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڵاو دەکرێنەوە، چونکە لەڕاستی دا هەتا ئێستا ڕۆژئاواییەکان وەك پێویست پێغەمبەری خوایان (ﷺ) نەناسیوەو، دەگونجێت زۆرێك لەڕۆژئاواییەکان بە نەزانی و بەهۆی نەبوون یاخود کەمی بانگخوازانەوە شوێنی ئەو درۆ و بوختانانە بکەون کە لەلایەن قین لەدڵەکانی گاورو جوولەکەوە بڵاو دەکرێنەوە.

هەروەها پێویستە موسڵمانان بەزمانی سەردەم ئەم پەیامە پیرۆزە بگەیەنن و هەوڵ بدەن کە خەڵك لەناوەڕۆکی ئەم ئاینە شارەزا بێت ، سەبارەت بە یەکتاپەرستی و بیروباوەڕی ئیسلامی و جیاوازی ئەم ئاینەو ئاینە شێوێنراوەکانی تر، کتێب و بڵاوکراوەچاپ بکەن و بەرنامەی تایبەتی بۆ بگیرێت، هەروەها پێویستە موسڵمانان زیاتر هەوڵ بدەن بۆ زیندوو کردنەوەی سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و کارپێ کردنیان، دەکرێت بۆ ئەم مەبەستە سوودێکی زۆر لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن وەربگیرێت، لەو ڕووەوە کارێکی پیرۆزە شان بەشانی کەناڵە قورئانیەکان چەند کەناڵێکی ئاسمانی

دیکەش دابمەزرێنرێن کە ئامانجیان بڵاوکردنەوەی ژیان و فەرموودەو سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بێت.

هەروەها لە چوار چێوەی بەرپەرچ دانەوەی ئەو دەست درێژیانەی دەکرێنە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێویستە چەندین دەزگاو دامەزراوە پێك بهێنرێن، بە مەبەستی چاودێری کردنی سەرجەم ئەو بڵاوکراوانەی لە جیهان دا دەردەچن، بەتایبەت چاو دێری توند بخرێتە سەر بڵاوکراوەکانی ئەو وڵاتانەی کە خولیایانە بێ ڕێزی بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەن، چونکە زۆربەی ئەو بڵاوکراوانەی لە ئەمڕۆی جیهان دا دەردەچن نەك تەنها ناگەنە دەستی موسڵمانان، بەڵکو تەنانەت بەدەستی زانایانی ئیسلامیش ناگەن، هەروەك پێویستە ئەوە بزانین ئەمڕۆ لە جیهان دا ژمارەی ڕۆژنامەو گۆڤارو بڵاوکراوەکان لە ئەژمار نایەن، لەبەر ئەو چاودێری کردنی ئەم بڵاوکراوانە لەتوانای کەس و دوو کەس دا نیەو ئەم کارە پیرۆزە پێویستی بەوەیە کە چەندین دەزگای بۆ دابمەزرێنرێت، هەتا ڕۆژانە بەشێوەیەکی بەردەوام چاودێری بڵاوکراوەکان بکرێت و پاشان ئەگەر پێویستی کرد بەشێوەیەکی ڕەسمی وەڵامی هەر بوختان و درۆیەك بدرێتەوە کە دژی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڵاودەکرێتەوە.

هەروەها بەرنامەیەکی دیکە بۆ بەرگری لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەیە کە پێویستە لە سەرانسەری جیهان دا چەندین دامەزراوەی وەرگێڕان پێك بهێنرێن بە مەبەستی وەرگێڕانی کتێبە ئیسلامیەکان بۆ سەر زمانە زیندووەکانی دونیا، چونکە بەداخەوە زۆرێك لەو وەرگێڕانانەی کە بۆ تەفسیری قورئان و فەرموودەکان کراون، هەڵەی زۆر زەقیان تێدایە، ئەوەتا تەفسیری قورئانی پیرۆز بەزمانی فەرەنسی چاپ کراوە کە هەڵەی بەرچاوی تێدایە ،بە هەمان شێوە لە زمانەکانی تریش لەکاتی وەرگێڕانی کتێبە ئیسلامیەکان دا هەڵەی بەرچاو کراون، لە یەکێك لە کۆنگرە ئیسلامیە جیهانیەکان دا کە لە فەرەنسا ساز کرا، کەسێك وتاری خوێندەوەو لە ڕاڤەی

فەرموودەی: (الناس كلهم عيال الله وأحبهم اليه أنفعهم لعياله) دا گوتی: الناس كلهم ابناء الله !

کەواتە پێویستە لە کاتی وەرگێڕانی هەر کتێبێک دا لیژنەیەکی پسپۆڕ پێداچوونەوە بۆ بەرهەمەکە بکات و پاش هەڵەچن و وەرگرتنی ئینجا چاپ بکرێت، دەبێت ئەوانەی بەپێداچوونەوەکە هەڵدەستن بە تەواوی شارەزای زمانی عەرەبی و ئەو زمانە بن کە بابەتەی بۆ وەردەگێڕدرێت.

پێویستە بزانین ئێمە بەپێی توانای خۆمان لەسەرمان پێویستە کە بەرگری لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەین هەتاوەکو لەڕۆژی دوایی دا لەڕوومان بێت بڵێین ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تکامان بۆ بکەو، هەمان کات دەبێت ئاگاداری ئەم چەند خاڵەبین کە بەرچاو ڕۆشنین بۆ ئێمە سەبارەت بە هەڵوێستی مێژینەی دوژمنان بەرامبەر پێغەمبەری خوا (ﷺ).

## یەکەم: دژایەتی کردنی دوژمنان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەتا ڕۆژی دوایی درێژەی هەیە:

ئەوەی کە لە قورئان و سوننەتەوە گەیشتووە ئەوەیە کە دژایەتی کردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەلایەن دوژمنانەوە هەتا ڕۆژی دوایی درێژەی هەیە، ئەمە بارودۆخی سەرجەم پێغەمبەران بووە،وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾﴾ الانعام: ١١٢.

ئیمامی (ابن كثير) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمووێت: خوای گەورە بە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرمووێت: ئەی (محمد ﷺ) چۆن کەسانێك هەن کە دوژمنایەتی و دژایەتی تۆ دەکەن و پێچەوانەی فەرمانەکانت دەجووڵێنەوەو ئازارت

دەدەن و بەدرۆت دەخەنەوە، بە هەمان شێوەش لەگەڵ پێغەمبەرانی پێش تۆدا هەڵسوکەوتیان کردووە، کەواتە: (با ئازاردان و دوژمنایەتی کردنت دڵگرانت نەکات).

هەروەها وەرەقەی کوڕی نەوفەل لەگەڵ هاتنە خوارەوەی یەکەم نیگادا بۆ پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)، ئاماژەی بەوەدا کە خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە بۆ لای هیچ گەلێك، ئیللا لەلایەن گەلەکەیەوە دووچاری دوژمنایەتی و ئاوارەیی کراوە! هەروەك (ابن عاشور)یش دەفەرمووێت: خوای گەورە بڕیاری بەپێغەمبەر بوونی هەر کەسێکی دەرکردبێت، دەبێت ئەو پێغەمبەرە دوچاری دوژمنایەتی کردن و ئازاردان ببێتەوە لەلایەن گەلەکەیەوە، کەواتە پەیوەندی نێوان پێغەمبەران و ئازارو دوژمنایەتی کردن پەیوەندییەکی ئاسایی و سرووشتیە، دەکرێت بڵێین ئەم هاوکێشەیە بۆ بانگخوازانیش بە هەمان شێوەیە، بەڵام شێوازی ئازاردانەکەیان جیاوازی هەیە.

## دووەم: چۆنیەتی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو هەڵمەتانەی دەکرێنە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەلایەن موسڵمانانەوە:

جگە لەو کاردانەوانەی دژی سووکایەتی کردن بەپێغەمبەر (ﷺ) ئەنجام دەدرێن، پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە خۆی لەخۆی دا قورئان و سوننەت بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمنانی ئیسلام دامەزراون، ئەوەش لەڕووانگەی بەرنامەیەکی شەرعی کە لەسەر بنەمای گەورەیی و ڕیزی پێغەمبەر (ﷺ) دامەزراوەو هەوڵ دەدات سیفەت و سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوون بکاتەوە، ئیدی چوون یەکە بەو جۆرە بێت کە لە قورئان دا یاخود لە فەرموودەو لەسەر زاری هاوەڵان دا ئەو سیفەتانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) باس کراون، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ﴿٤٦﴾﴾ الاحزاب: ٤٥،٤٦.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾﴾ القلم: ٤.

واتە: بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خوویەکی زۆر جوان و پەسەندو بێ وێنەو جوانیت.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾﴾ الانبیاء: ١٠٧.

واتە: ئەی (محمد ﷺ) ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە، تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە ببیتە ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ هەموو جیهانەکان.

هەروەها پەروەردگار لە چەندین ئایەتی تردا باس لەڕێزو گەورەیی پێغەمبەرە بەڕێزەکەی (ﷺ) دەکات.

هەمان کات لە چەندین فەرموودەدا پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) ئاماژەی بەڕێزو پلەو گەورەیی خۆی کردووە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرموودەیەکی دا ئاماژە بەوە دەکات کە خوای پەروەردگار لەناو کوڕەکانی ئیسماعیل دا کەنانەی هەڵبژاردووە، وە لەناو کەنانەش دا قورەیشی هەڵبژاردو لەناو قورەیشیش دا بەنی هاشمی هەڵبژاردو لەناو ئەوانیش دا منی هەڵبژارد هەتا بمکاتە کۆتا پێغەمبەری گرۆی بەشەریەت.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: من چەند ناوێکم هەیە من (محمد)م، من (احمد)م، من (ماحي)م واتە: لابەرم، خوا کوفر بەمن لا دەبات، من (حاشر)م واتە: ئەو کۆکەرەوەم کە خەڵك لە سەردەمی مندا حەشر دەکرێت، من (عاقب)م، واتە: ئەو دوا کاروانەم کە کەسی ترم بەدوادا نایەت، خوای گەورەش بە (رؤوف الرحيم) ناوی بردووە.

(أبو بردة) لە باوکیەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرمووێت: نوێژی مەغریبمان کرد لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) لە پاشاندا وتمان: خۆزگە چاوەڕێمان بکردایە هەتا نوێژی عیشاشمان لەگەڵدا دەکرد، پاشان دانیشتین هەتا هاتە ناومان و فەرمووی: هێشتا لێرە ماون.؟! وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی مەغریبمان لەگەڵ کردی.! وتمان دادەنیشین هەتا نوێژی عیشاشی لەخزمەتدا دەکەین فەرمووی چاکتان کردو

پێکاتـان. ! پاشـان سـەری بـەرەو ئاسمـان بـەرز کـردەوەو فـەرمووی: ئەسـتێرەکان سەلامەت بن بۆ ئاسمان. ! هەر کات ئەستێرەکان نەمان ئاسمان دووچاری ئـەو بەلاٌیـە دەبێـت کـە وادەی پێـدراوە، مـن سـەلامەتیم بـۆ ئوممـەتم هـەرکات ڕۆیـشتم یارەکـانم دووچاری ئەو کارەساتە دێن کە وادەیـان پێـدراوە، یارەکـانم سـەلامەتین بـۆ ئوممـەتم، هەر کات یارانم نەمان، ئوممەتم دووچاری ئەو کارەساتە دەبێت کەوادەی پێدراوە. ! ؟

بەر لەبێ ڕێزی کردنی دوژمنان بەپێغەمبەر (ﷺ) و پاش ئەوەش، ئا ئەوەیـە ڕێـزو گـەورەیی پێغەمبەرەکـەمان (ﷺ) لـە ئاسمـان و زەوی دا، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) گەورەترین پلەو پایەی هەیەو هیچ کەس ناتوانێت بەو پلەیـە بگـات، خـوای گـەورە لـە بچووکترین سوورەتی قورئان دا گەورەترین ڕێـزو پایـەو خۆشەویـستی بـەو پێغەمبـەرە ئازیزە (ﷺ) بەخشیوە، کە لەپێش ئەو و لەپاش ئەویش ئەو پلەیە بـە هـیچ دروسـت کراوێکی خوای گەورە نەدراوە.

ئـەم ئاینـە بەدرێـژایی مێـژووی خـۆی هـەوڵی داوە بـەردەوام زانیـاری ورد لـەبارەی هەموو بوارەکانی خۆیەوە بە مرۆڤایەتی بگەیەنێت، ئیسلام پەیامی خۆی بەشێوەیەکی زۆر ئاشکراو ڕاستگۆیانە گەیاندووە، لەو ڕووانگـەوە ئیسلام هـەوڵی داوە ئـەو نـوورەی خـۆی، هـەموو گـەلانی جیهـان بـەجیاوازی ڕەگـەزو زمـان و نەتـەوەوە بگرێتـەوە، بـە ئامانجی ئەوەی کە کەمترین مرۆڤ ببنە قوربانی و هاوەڵی ئـاگر، بـەردەوامیش دەرگـای ئاینی خوا بۆ هەموو مرۆڤایەتی کراوەیەو لە داهاتووشدا سەرکەوتنی زۆر گەورەو یەکلا کەرەوە دەبینین و ئاینی تاقانە پەرستی بـە تـەواوەتی بەسـەر کـوفرو بـێ بڕوایـی دا سـەردەکەوێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾﴾ الفتح: ٢٨.

واتە: خوا ئەو زاتەیە کە پێغەمبەری خـۆی (ﷺ) ڕەوانـە کـردووە، هـاوڕێ لەگـەڵ ڕێنموونی و پەیامی ڕاست و درووست دا، بۆ ئەوەی زاڵی بکات بەسـەر هـەموو پـەیام و بەرنامەکانی تردا، خوا هەر خۆی بەسە بۆ شایەتی دان و ئاشکرا کردنی ئەو ڕاستیە.

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: خوای گەورە زەوی بۆ هێنامەوە یەك، تا ئەو ئاستەی کە هەموو ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوام دەبینی! تیایدا زۆرترین پشکی زەوی بەر ئوممەتەکەی من کەوت، هەروەها هەردوو گەنجینە ڕەش و سپییەکەم پێ بەخشرا، واتە لە هەردوو ڕەگەزەکە (سپی پێست و ڕەش پێست) خەڵکانێکی زۆریان موسڵمان دەبن.

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: موسڵمانان (جەنگی دوورگەی عەرەب) دەکەن پاشان خوای گەورە بۆیان ئازاد دەکات، دواتر (جەنگی فارس) دەکەن‌و خوای گەورە بۆیان ئازاد دەکات، پاشان (جەنگی ڕۆمەکان)یش دەکەن و بۆیان ئازاد دەکرێت، پاشان (جەنگی دەجال)یش دەکەن و خوای گەورە لەناوی دەبات.

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە چەندین فەرموودەدا ئاماژەی بەوە کردووە کە ڕۆژێك دێت خوای گەورە ئەم ئاینە بەشێوەیەك شکۆمەند دەکات کە هەر شوێنێك شەوو ڕۆژی پێ بگات ئەم ئاینەی پێ دەگات.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: بەردەوام تاقمێك لە ئوممەتەکەم لەسەر حەق دەمێنن و نابەزن، هەر کەسێکیش بیەوێت سەرشۆڕیان بکات ناتوانێت زیانیان پێ بگەیەنێت، تاوەکو فەرمانی خوا بۆ مردنیان دێت و ئەوان هەروا دەبن.

پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە دابەزینی پێغەمبەر عیساو کارکردنی بەپێی شەریعەتی ئیسلام گەورەترین ڕێزو سەروەرییە کە خوای گەورە بەهۆیەوە لەم ئوممەتەی ناوە، دەبێت چی بێت لەوە گەورەتر بۆ ئوممەتی (محمد ﷺ) کە پێغەمبەرێکی (اولوا العزم) لەپاش ئیمامێکی ئوممەتەکەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) نوێژ بکات. !

ئەم چەند ئایەت و فەرموودانەو چەندانی تریش سەلمێنەری ئەو ڕاستیەن کە داهاتوو بۆ ئیسلام و موسڵمانانە. !

## سێیەم: بەدرێژایی مێژوو دوژمنان دژایەتی پێغەمبەرو (ﷺ) ئوممەتەکەیان کردووە:

ئامانجیان ئەوە بووە کە ببنە کۆسپ لە بەردەم بڵاوبوونەوەو گەشەکردنی ئیسلامدا، چونکە لەوە دڵنیان کە هەرگیز ناتوانن ئەم ئاینە لەناو بەرن، بەڵکو دەیانەوێت بەم سەنگەر گرتنەیان لە ئیسلام و موسڵمانان ،ڕێگە بگرن لەزیاتر دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەو سەرکەوتنی ئیسلام .

بێ گومان هەرگیز ئاینی ئیسلام حەزی نەکردووە خوێن لەناو گرۆهی بەشەریدا بڕژێت، بەڵام دوژمنان هیچ کات ڕێگە بەوە نادەن ئاشتی لەگەڵ ئیسلام و موسڵماناندا بکەن؟ چونکە چاك لەو ڕاستیە گەیشتوون کە ئیسلام ئاینێکە سوود لە ئاشتی وەردەگرێت بۆ زیاتر گەشە کردن و بڵاوبوونەوەی.

ئەوەتا جوولەکەکانی مەدینە پاش ئەو هەموو چاکانەی پێغەمبەر (ﷺ) بەرامبەریان کەچی لە بەرامبەردا بە مەکرو فێڵ وەڵامی پێغەمبەریان (ﷺ) دەدایەوەو! بەردەوام بۆ هەلێك گەڕاون تا تۆڵەو کینەی مێژوویی خۆیان لەئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بکەنەوە، ئەگەر لە قورئان و سوننەت ورد ببینەوە زیاتر ڕادەی دژایەتی دوژمنان بۆ ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەردەکەوێت، تەنانەت پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ) دوژمنان زیاتر کەوتنە دژایەتی و جەنگ کردن لەگەڵ موسڵمانان دا، تا ئەو ڕادەیەی کە بە پیلانی ئەوان هەندێك موسڵمان لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، ئیدی با ئەوە بووەستێت کە گەورەترین ناکۆکی و جەنگ لەنێوان هاوەڵان دا بەرپا بوو، بەدڵنیاییەوە زۆربەی ئەم کێشانە لەلایەن دوژمنانەوە ئاگرەکەی خۆش کراوە ، لەو میانەدا گاورو جوولەکە پشکێکی گەورەیان بەردەکەوێت و، بەردەوام ئەوان بە هاوکاری دووڕووان لە دووی هەلێك گەڕاون هەتا داخی خۆیان لەدژی ئیسلام بڕێژن،بەڵێ لەگەڵ فراوان بوونی سنووری دەوڵەتی ئیسلامی دا، دوژمنان

ئەوەیان بە هەل زانی هەتا بەکرێ گیراوەکانی خۆیان بە جیهانی ئیسلامی دا بلاو بکەنەوە، بۆ دروست کردنی ناکۆکی و ڕا جیایی و شەڕو ئاژاوە لەناو موسڵمانان داو پاشانیش زاڵ بوون بەسەر ئیسلام و موسڵمانان دا، ئەنجامی ئەم دۆخەش کە دوژمنان بۆ ئیسلامیان دروست کرد موسڵمانانی زیاتر هان دا هەتا تۆکمەتر دەست بە ئاینەکەیانەوە بگرن ! هەر لەگەڵ کۆچی دوایی پێغەمبەردا (ﷺ) هاوەڵان هەموو کۆششێکیان بۆ ئەوە بوو فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بپارێزن و لە فەوتان و لەناوچوون ڕزگاریان بکەن، بەو شێوازەی کە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بەرگوێیان کەوتوون بە وەچەکانی تریان بگەیەنن، هەر لەم ڕووانگەوە بوو خوای گەورە کۆمەڵێك زانای بواری فەرموودە ناسی خەڵاتی ئەم ئوممەتە کرد ، هەوڵی سەرەکییان بۆ ئەوە بوو فەرموودە دروستەکانی پێغەمبەر بپارێزن و ڕێگە نەدەن دوژمنان فەرموودەی هەڵبەستراویان تێکەڵ بکەن و، بۆ ئەم مەبەستە هاتن بەشێوەیەکی زۆر وردو بابەتیانە فەرموودە درووستەکانیان لەوانی تر جیاکردنەوەو لەو ڕووانگەوە زانستی فەرموودەناسی و پۆلێن کردنی فەرموودەکانیان دانا، هەمان کات دەیان زانای وەك ئیمامی بوخاری و موسلیم و نەسائی و ئەحمەد.... هاتنە مەیدانەکەوەو کەوتنە کۆکردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەمەش لەو پێناوە دابوو کە قورئان و سوننەتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لە بچووکترین گومان و خەوش و خاڵی دوژمنان پارێزراو بێت.

هەر لەو پێناوەدا گەورەترین شۆڕش بەرپاکراو، هەزاران زاناو کەڵەپیاوی ئیسلامی هاتنە مەیدانەکەوەو، لەبوارەکانی عەقیدەو فیقهو نەحو صەرف و ژیانی پێغەمبەر و مێژووی ئیسلامی دا بوونە چرایەك و! توانیان موسڵمانان لە نەخشەو فێڵی دوژمنان بپارێزن و هێڵە ڕاستەکانی ئاینیان بۆ ئەم ئوممەتە ڕۆشن کردەوە.

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە لەئەنجامی ئەو جەنگانەی کە بێ بڕوایان لەدژی ئیسلام بەرپایان کردن، ڕاستە دەوڵەت و حوکمداری موسڵمانان بەشێوەیەکی کاتی کۆتایی پێ هات، بەڵام سوپاس بۆ خوا موسڵمانان پاش ئەو هەموو پیلانانەی دوژمنان توانیان پارێزگاری لە ئاینەکەیان بکەن و بەقورئان و سوننەت و بیروباوەڕەوە بیپارێزن، لەڕاستیدا ئەمەش گەورەترین سەرکەوتنە کە بۆ ئەم ئاینە تۆمار کراوە.

بەڵێ بەدرێژایی مێژووی ئیسلام دوژمنان بەردەوام لە هەوڵدا بوون بۆ کوژاندنەوەی نووری ئیسلام، ئازاردانی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی و هەوڵدان بۆ کوشتنی لە سەردەمی بانگەوازی مەککی و مەدەنی دا ، بەشێك بون لەو هەوڵانەو، پاشانیش دروست کردنی ئاژاوەو ڕا جیایی لەنێوان هاوەڵان دا کە بە پیلانی جوولەکەو گاورەکان ئەنجام درا، بە هەمان شێوە ئەمەش هەوڵێکی تری دوژمنان بوو بۆ لەناو بردنی ئەم پەیامەو، دواتریش گەورەترین هێرشی مەغۆل و خاچ پەرستان بەرۆکی جیهانی ئیسلامی گرت بەئامانجی لەناو دانی پەیامەکەی (محمد ﷺ) ! بەڵام سوپاس بۆ خوای بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی کە ئەم ئوممەتەی لەو هەموو پیلانانە پاراست.

لە سەردەمی نوێش دا دوژمنان بەشێوازێکی تر کەوتنە دژایەتی کردنی پێغەمبەری خواو (ﷺ) ئاینەکەی، بەڵێ لەم سەردەمەدا دوژمنان بەردەوام قورئان و سوننەت و پێغەمبەرەکەیان (ﷺ) کردووەتە ئامانج و هەمان کات هەوڵ دەدەن لەڕێی دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە وەچەکانی موسڵمانان لە ئیسلام دوور بخەنەوە، هەموو هەوڵی دوژمنان ئەوەیە کە موسڵمانان دەستبەرداری ڕەوشتە ئیسلامیەکان ببن و، دەیانەوێت بەناوی ئازادیەوە موسڵمانان بەرەو لادانە ڕەوشتیەکانی ڕۆژئاوا ئاڕاستە بکەن.

ڕاستە بێ ڕێزی کردنی ڕۆژئاواییەکان بەپێغەمبەر (ﷺ) و پەیامەکەی شتێکی زۆر قورسە لەلای موسڵمانان، بەڵام لە هەمان کات دا پێویستە دڵخۆش بین و سوپاسی

پەروەردگار بکەین، چونکە هێرش کردنە سەر ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بەڵگەی زیندوویەتی و بەهێزی ئەم ئاینەیە.

کەواتە هەتا ئیسلام زیاتر دژایەتی بکرێت لەلایەن ڕۆژئاواییەکانەوە زیاتر پێگەی خۆی لەڕۆژئاوادا قایم دەکات، ئەی نابینن پاش ڕووداوەکانی یانزەی سێپتەمبەر لەڕۆژئاوادا ئیسلام چەندە لەگەشەکردندایە! پەیتا پەیتاو لە هەموو گەل و نەتەوە جیاوازەکانی دونیا خەڵك بەلێشاو دێنە ناو ئاینی خواوە.

وەك بینیمان لەم چەند ساڵەی دوایشدا ڕاستەوخۆ هێرشەکان لەسەر شەخسی پێغەمبەر (ﷺ) چڕ کرانەوە، بەڵام سوپاس بۆ خوا لەکۆتایی دا هەموو هێرشەکان بەسوودی ئیسلام و موسڵمانان کۆتاییان دێت، لێرەوە ڕایدەگەیەنین کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئیسلام و موسڵمانان سەرکەوتنی گەورەتر بەدەست دەهێنن، چونکە پەروەردگار خۆی بەڵێنی داوە کە ئەم ئاینەو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) سەربخات، بەڵێ ئەو خوایەی ڕووداوی (افك)ـی بەدرۆ خستەوەو بەسوودی موسڵمانان کۆتایی پێ هێنا، هەر ئەو خوایە (ان شاءالله) بێ ڕێزیەکانی دوژمنانی پێغەمبەر (ﷺ) بەسوودی موسڵمانان دەشکێنێتەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ۚ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم ۖ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ ۚ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾﴾ النور: ١١.

واتە: بێگومان ئەوانەی بوختانەکەیان هەڵبەست دەستەیەك بوون لە خۆتان (یاخود وا خۆیان نیشان دەدا کە لە خۆتانن) وا مەزانن ئەو بوختانە شەڕو خراپە بوو بۆتان، بەڵکو خێر بوو بۆ ئێوە، تاکو ئیمانداران لە دوو ڕووان جیا بکرێنەوە ، بێ گومان تاوانی هەر کەس لەو بوختان چییانە لە گەردنی خۆیدایەتی، ئەو کەسەش کە سەرۆك‌و گەورە و هەڵبەستی بوختانەکەیە، سزایەکی سەخت و گەورەی بۆ ئامادەیە.

کەواتە پێویستە بەشێوەیەك بیر بکەینەوە کە ئەم هێرشانە لەداهاتوودا دەبنە خێرو چاکە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و ئوممەتەکەمان.

## پێنجەم: بەرگری کردن لە پێغەمبەر (ﷺ) و ئوممەتەکەی، شکۆمەندییە، گەورەییە، ڕێزە:

بەرگری کردن لە پێغەمبەر (ﷺ) و بەرنامەکەی، دەبێتە شکۆو ڕێزو گەورەیی بۆ هەر کەسێك کە لەم سەردەمەدا بەو کارە گرنگە هەستێت، ئەوە پیرۆزترینی ئەو سەنگەرانەیە کە پێویستە هەر یەکەمان بەپێی تواناو پسپۆری خۆی ئامادەیی هەبێت بۆ بەرگری کردن لە پێغەمبەرەکەی،

هەروەك ئەرکی سەرەکی بانگخوازانیشە خەڵك بانگهێشت بکەن بۆ باوەڕ هێنان بەپێغەمبەر (ﷺ) و ڕێز لێ گرتنی و بە گەورە سەیر کردنی، پێویستە خەڵك لەو ڕاستیە تێ بگەیەنرێت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نێردراوە هەتا ڕەحمەت بێت بۆ هەموو گرۆهی ئادەمیزاد و تەنانەت ئەو پێغەمبەرە ئازیزە (ﷺ) بۆ ئاژەڵ و باڵندەش بە ڕەحم و سۆز بووەو، دەبێت لەم ڕووانگەوە بانگخوازانی ئەم ئاینە بەتایبەت لەڕۆژئاوادا زیاتر تێکەڵی خەڵکی ئاینەکانی تر ببن ، هەتا ببنە بەرچاو ڕونیەك و لەو ڕووەوە ئەگەر ڕۆژئاواییەك شوێن ئەم ئیسلامە نەکەوت، با لانی کەم ئامادە نەبێت بێ ڕێزی پێ بکات، ئەگەر بانگخوازەکانمان بەو ڕۆحیەتەوە کاریان کرد ئەوا بەبێ گومان دەبنە بەرچاو ڕۆشنیەك بۆ ئەو کەسانەی کە بە شوێن حەق و ڕاستی دا دەگەڕێن.

چونکە لای هەمووان ئاشکرایە یەکێك لە مەرجەکانی درووستی باوەڕەکەمان، ئەوەیە کە باوەڕ بەپێغەمبەر (ﷺ) بکەین و ، بەشکۆو ڕێزەوە سەیری بکەین و لە فەرمانەکانی دەرنەچین،بێ گومان ئەگەر ئێمە بمانەوێت باوەڕەکەمان تەواو دامەزراو بێت دەبێت بەردەوام لەگەڵ پێغەمبەرەکەمان دا (ﷺ) پەیوەندیمان هەبێت، چونکە ئەو هۆکار بووە هەتا ئێمە ئەم ڕێبازە جوانە بناسین خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ

عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٨﴾﴾ الاعراف: ١٥٧،١٥٨.

**بێ گومان ئەوانەی بێ ڕێزی بە پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن یەك لەم دوو گرووپانەن:**

گرووپێکیان دەزانن کە ئاینی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ڕاست و درووستن بەڵام گاڵتەیان پێ دەکەن لەبەر بوغزو حەسوودی خۆیان،لەم بارەوە پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١٤٧﴾﴾ البقرة: ١٤٦،١٤٧.

ئەمانە هەرگیز ئامادە نین باوەڕ بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەن، بەڵکو بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدان کە لە ڕێزو شکۆو گەورەیی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە (ﷺ) کەم بکەنەوە، بێ گومان ئەمەشیان بۆ ناچێتە سەر، چونکە پەروەردگار خۆی ڕێزی لەو پێغەمبەرە گرتووە.

گرووپی دووەمیش پێغەمبەری خوایان (ﷺ) لەچاوی گومان و ڕاگەیاندنی ڕۆژئاواوە ناسیوە، ئەمانە لەقۆناغی خوێندنی سەرەتاییەوە بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاشنا بوون، ئاشکرایە کە لە قوتابخانەو زانکۆکانی ڕۆژئاوادا وەها خراوەتە مێشکی قوتابیەوە کە کەسایەتی پێغەمبەر (ﷺ) کەسایەتییەکی توندڕەو و خوێن ڕێژ بووەو ستەمی لە ئافرەتان کردووە، سەبارەت بەقورئانیش وەها منداڵەکانیان گۆش دەکەن کە قورئان هیچ نییە جگە لە چەند هەواڵێکی دزراو کە لە تەورات و ئینجیلەوە هێنراون، ئەم گرووپەش بەهۆی ئەم بوختان و درۆیانەوە گومڕا کراون، دەکرێت ئەمانەش لەڕێی بانگەوازو ڕوون کردنەوەی ئیسلامەوە بهێنرێنە سەر ڕێگای ڕاست، پێویستە قورئان و

سوننەت و پێغەمبەری خوایان (ﷺ) وەك ئەوەی کە هەن پـێ بناسـرێت،بەدڵنیاییەوە ئومێدێکی زۆر هەیە کەلـە داهـاتوودا ئـەم گروپـە هەڵوێستیان سـەبارەت بـەم ئـاین و پێغەمبەرە بگۆڕدرێت و بێنە ناو ئاینی خواوە، شیاوی باسە زۆربەی ئەو ڕۆژئاواییانـەی کەلەئێـستادا موسـڵمان دەبـن لـەم گرووپـە پێـك هـاتوون. پێویـستە بانگخوازانمـان لەڕۆژئاوادا زیاتر گرنگـی بـدەن بـە ناسـاندنی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) و ئاشـنا کردنـی تـاکی ڕۆژئـاوایی بـە سـیفەتەکانی ، لـەو ڕووەوە ئامـاژە بکرێـت بەسـۆزو میهرەبـانی و دادگەری و ڕاسـتگۆیی و ئـارامی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)، هـەروەها شـێوازی هـەڵس و کـەوتی لەگـەڵ خێزانـەکان و هـاوەڵان و دۆسـت و دوژمنـان دا ڕوون بکرێتـەوە، هـەتا ڕۆژئاواییەکان پێغەمبەر (ﷺ) وەك خۆی بناسن، وە بۆ زیـاتر ناسـاندنی پێغەمبـەری خواش (ﷺ) پێویستە بانگخوازو وتار بێژان شتێك پێشکەشی ڕۆژئاواییەکان بکەن کە لەگەڵ دۆخی ئەوان دا بگونجێنێت و هەمان کات ڕەچاوی (ثوابت)ـەکان بکرێـت و، لـە هەموو بوارەکانی ئابووری و کۆمەلایەتی و ڕامیـاری و مرۆیـی دا بـاس لـەڕۆڵ و پێگـەی ئیسلام بکرێت و، هەمان کات پەرۆشی ئیسلام بۆ ژیانی مرۆڤ و تەنانەت ژیانی ئـاژەڵ و پاراستنی ژینگەو کۆمەڵگا لەپیس بوون ڕوون بکرێتەوە.

## داهاتوو بۆ ئیسلامە:

شەهید حەسەن بـەننا دەفـەرمووێت: شارسـتانیەتەکان هەمیشە لـە ئەمسەرو ئـەو سەر کردنی دونیادان، جارێ لە ڕۆژهەڵاتدا دروست دەبن وگەشەدەکەن و ئەپوکێنـەوە، جارێ لە ڕۆژئاوادا دروست دەبن وگەشە دەکەن و ئەپوکێنەوە.

هەروەها شەهید سەید قوتب دەفەرمووێت: سەرکردایەتی کردنـی مرۆڤـی ڕۆژئـاوایی ڕووی بەرەو ئاوا بوون ناوە! چونکە شارستانیەتەکەی لەڕووی ڕەوشت و قییەمەوە لـە دەست داوە.

بەڵێ بەبڕوای زۆرێك لە چاودێران ،لەسەر خۆو بەهێواشی خەریکە ڕۆژئـاواو ئـەمریکا بەرەو هەڵدێرو نەمان هەنگاو دەنێن. !

بیریـار ماکنیـل دەڵێـت: شارسـتانی ڕۆژئـاوا لـەم دواییانـەدا وەکـو وەحـشێکی لێهاتووە،ئەوەندە دڕندە بـووە پـەلاماری هـەموو شـتێك دەدات و هـەموو بـەها بـەرزو باڵاکان دەشکێنێت و ئێستاش چنگی ئاڵاندوەتە ڕیخۆڵەکانی خۆیی ولەوەدایە کە خۆی لەناو بەرێت. !

شـبلنگیر کـە بیریـارو فەیلەسوفێکی ئەڵمانیـە دەڵێـت: شارسـتانیەتەکان دەورانـی فەلەکیان هەیە،لێرەدا ئاوا دەبێت ولە شوێنێکی تردا هەڵدێت،موژدە ؟ شارسـتانیەتێکی نـوێ خەریکـە هەڵـدێت لـە جـوانترین شـێوەدا کـە ئـەویش شارسـتانیەتی ئیـسلامە، گەورەترین توانای جیهانی ڕۆحی پاکی هەیە. !

بێگومـان ئـەوەی وادەکـات کـە قەناعـەت بکـەین ئـەمجارە نـۆرەی شارسـتانیەتی ئیسلامیە بێتەوە سەر شانۆی ژیـان ئەوەیـە، کـە شـەڕەکانی ئـەم سـەردەمە هـەمووی شەڕی ئاینین و بەناوی ئاینەوە بەرپا دەکرێن، بۆ نمونە شەڕ لە شیشان یان کۆسـۆڤۆو فەڵەستین و تەنانەت جـەنگی دژە تیرۆریـش هـەر جـەنگێکی ئاینیـە،وەك چـۆن بـۆش لەسەرەتای ڕووداوەکانی یانزەی سێپتەمبەردا ڕایگەیانـد بـەوەی کەئـەم شـەڕەی دژی موسڵمانانی ئەفغانستان و عێراق پەرپای دەکـەن شـەڕی خـاچ پەرستیە ! بەڵگەیـەکی تریش کە دەیسەلمێنێت ئەم سەدەیە سەدەی گەڕانەوەی ئیسلامە ئەوەیە:کە زۆرێك لە زاناکان ئاماژە بەوە دەکەن ئەو سەدەیەی ئێستا ئێمـەی تێدا دەژیـن سـەدەی ئـاین و گەڕانەوەی خەڵکیە بـۆ بـەها ڕۆحیەکان،چـونکە خـەڵکی بەگشتی و ڕۆژئاواییـەکان بـە تایبـەتی لـەڕووی بۆشـایی ڕۆحییـەوە لـە قەیراندان،تـەنها ئـاینێکیش بتوانێـت ئـەم بۆشاییەیان بۆ پڕبکاتەوە تـەنها ئـاینی ئیـسلامە ! لـەم بـارەوە (ئەنـدرێ مـالۆری) کـە فەیلەسوێکی فەرەنسیە دەڵێت: سەدەی بیست سەدەی زانست بوو،بـەڵام لـە سـەدەی بیست و یەکدا ڕۆح پەرەدەسێنێت. !

هـەروەها (جـۆن مـۆرای) کـە ئەنـدامی لیژنــەی کاروبـاری دەرەوەی کۆنگرێـسی ئەمریکیە بە ویژدانەوە دێتە ئاخـافتن و دەبێـژێت: مـن وائـەزانم سـەدەی بیـست ویـەك

سەدەی ئاینی ئیسلام دەبێت و بەوەش ئاشتی و خۆش گوزەرانی زیاتر باڵ بەسەر جیهاندا دەکێشێت؟.

دکتۆر هۆفمان کە ڕۆشنبیرێکی گەورەی ناو ڕۆژئاوایەو پاش عەودالییەکی زۆر بەدوای ڕاستیدا،خوای گەورە ڕێنمونی کردو موسڵمان بوو،ناوبراو ماوەیەك سەفیری ئەڵمانیا بووە لە جەزائیرو مەغریبدا،هۆفمان پاش موسڵمان بوونی چەند کتێبێکی گرنگی نووسی، دکتۆر هۆفمان لەکتێبەکانیدا ،وەك زۆرێکی تر لە زانایان و بیریارانی ڕۆژئاوا دیدی خۆیان باس دەکەن دەربارەی دەردو نەخۆشیەکانی ڕۆژئاواو بە دڵنیاییشەوە چارەسەر تەنها لەئیسلامدا دەبیننەوە!

هۆفمان دەڵێت (ئەمریکاو وڵاتانی ڕۆژئاوا خاکێکی تینون بۆ ئیسلام کەساڵ لەدوای ساڵ زیاتر ئیسلام لە ئامێز دەگرن...هەروەهادەڵێت ئێستا لە سەدا بیستی مامۆستایانی کۆلیژە پزیشکیەکانی ئەمریکا موسڵمانن!...شایانی باسە کەقورئان وەرگێڕدرا بۆ زمانی ئینگلیزی لەسەدا هەزار چاپ کردنی زیادی کردووە...ناوبراو لەدرێژەدا دەڵێت: ڕۆژئاوا ئیسلام بە تیرۆر تۆمەتبار دەکات،بەڵام ئەمە هانی خەڵك دەدات هەتا زیاتر بەدوای ئیسلامدا بگەڕێن بۆشارەزا بونیان لە خودی ئاینەکە،من خۆشحاڵم کەڕۆژئاواییەکان بە دیراسەو تێگەیشتنەوە ئیسلام وەردەگرن،من زۆر گەشبینم لە کاتێکدا ئیسلام بەبەدیل دەبینم لە ڕۆژئاوادا؟).

هەروەها ژنە زانای فەرەنسی (ئیفالامات دیمترا) دەڵێت: دیاردەی هاتن بەرەو ئیسلام لە ئێستادا شایەنی لەسەر وەستانە!پابەند بوونی لاوانی ڕۆژئاوا بەئیسلامەوە سەر ئەنجامی ئەو پرسیارانەیە کە لە دڵ و دەرونیاندا دروست بون،تەنها ئیسلامیش دەتوانێت وەلامی پرسیارەکانیان بداتەوە...لە ڕابردوودا زیاتر زانایان ومامۆستایان و توێژەرەوان دەهاتن بەرەو ئیسلام،بەڵام لە ئێستادا لە هەموو چین و توێژێك دێنە ناو ئاینی خواوە!

هەر لەم بارەوە بەرنادشۆ دەڵێت: لەداهاتووداو لە کۆتایی ئەم سەدەیەدا ئاینی ئیسلام لە ڕۆژئاوادا بڵاو دەبێتەوەو ئینگلتەرە دەبێتە ئینگلتەرەیەکی موسڵمان!.

# پەیامی کۆتایی کۆنگرەی (رحمة للعالمین)

بە مەبەستی زیاتر ڕووبەڕوو بوونەوەی موسڵمانان، بۆ ئەو بێ ڕێزیانەی کە بەرامبەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکرێن و زیاتر بلّند بوونی ناوی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە (ﷺ)، بەئامادە بوونی کۆمەڵێك لەزاناو بانگخواز و ڕۆشنبیرانی ئەم ئوممەتە لە (١٣ - ١٥)/١١/٢٠٠٧ لە خەرتوومی پایتەختی سوودان کۆنگرەی (رحمة للعالمین) دەستی بەکارەکانی خۆی کرد.

لەپاش چەندین کۆبوونەوەو بیروڕا گۆڕینەوە لە ئەنجام دا کۆنگرەکە بەم چەند ڕاسپاردەیە کۆتایی بەکارەکانی خۆی هێنا:

**یەکەم: دەرخستنی پێگەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ئیسلام دا:**

کۆنگرەکە پێداگری لەسەر ئەوە کرد کە پێویستە موسڵمانان زیاتر پێغەمبەری خوا بە گەورە بگرن و خۆشەویستی بۆ دەرببڕن و سوونتەکانی جێ بەجێ بکەن.

**دووەم: تایبەتمەندی (تخصص) لە بەرگری کردن لە پێغەمبەری خوا (ﷺ):**

ئامادەبووانی کۆنگرەکە داوایان کرد کە ڕەچاوی تایبەتمەندی (تخصص) بکرێت لە بەرگری کردن لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و، هەمان کات داوایان کرد کە وەلآمی ئەو زنجیرە بێ ڕێزیانە بدرێتەوە کە دەکرێنە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)،و پێویستە ئەو بەرنامەیە بەشێوەیەکی زانستی ڕێکخراو بێت و ،چەند دەزگایەك بەو کارە هەستن و لەو بارەوە چەندین لیژنە دابنرێن و ئامادەکاری باشی بۆ بکرێت.

**سێیەم: دیاردەی تانەدان لە پێغەمبەر (ﷺ) بخرێتە بەر شی کردنەوەی فیکرییەوە:**

ئەندامانی کۆنگرە داوایان کرد کە زیاتر گرنگی بدرێت بە توێژینەوە کردن لە دیاردەی تانەدان لەپێغەمبەر (ﷺ)، هەروەك داوایان کرد لەم ڕووەوە ڕێ و شوێنی پێویست بگیرێتە بەر لەسەر ئاستی هەموو جیهان.

**چوارەم: زیاتر کاراکردنی ئەو لیژنانەی کە تایبەتن بە بەرگری لەپێغەمبەر (ﷺ):**

کۆنگرەکە داوای کرد ڕۆڵی سەرجەم لیژنەکانی سەرخستنی پێغەمبەر (ﷺ) کارا بکرێن و، لەم ڕووەوە داوای کرد کە پێویستە هەموو دامەزراوەو لیژنە تایبەتەکانی ئەو بوارە پەیوەندی بەردەوامیان بە یەکەوە هەبێت بۆ زیاتر ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو هێرشانەی کە دەکرێنە سەر پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەك داوا لە سەرجەم موسڵمانان کرا لەو ڕووەوە ئاسان کارو هاوکاری لیژنەکان بن.

**پێنجەم: تەئکید کردنەوە لەسەر ڕۆڵی زانایان و بانگخوازان:**

کۆنگرەکە داوا لە زانایانی ئاینی و بانگخوازان دەکات کە لەو ڕووەوە زیاتر هەوڵ و کۆشش بکەن و، خۆیان بە بەرپرس بزانن لەئاست سەرخستنی کارەکانی پشتگیری کردنی پێغەمبەردا (ﷺ).

**شەشەم: پێشکەش کردنی بانگخوازو وتاربێژی بەتوانا بەکۆمەڵگای ڕۆژئاوایی:**

ئەندامانی کۆنگرە داوایان کرد کە بانگخوازو وتار بێژی بەتوانا پێشکەشی ڕۆژئاواییەکان بکرێت و، هەمان کات ئەرکیان دیاری بکرێت و هەوڵ بدەن بەشێوەیەکی گشتی لە هەموو گەلان نزیك ببنەوەو بەردەوام سەردانی دەزگاو دامەزراوەو کەسە دیارەکانی ڕۆژئاوا بکەن، هەروەها پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسانە دا پتەو بکەن کە هەڵوێستیان سەبارەت بە ئیسلام باشەو هەوڵ بدرێت لە داهاتوودا بەرەو ئیسلام بانگ بکرێن، وە هەوڵ بدەن وتوو وێژ لەگەڵ ئەو کۆمەڵ وگروپە توندڕەوانەدا بکەن کە هێرش دەکەنە سەر ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ولەو بارەوە بەتوندی بەرپەرچ بدرێنەوە.

**حەوتەم: بایەخدان بە وەرگێڕان:**

ئەندامانی کۆنگرەکە بەگرنگییەوە داوایان کرد کە قورئان و فەرموودەو بڕیارە شەرعیەکان و ژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەربگێڕدرێنە سەر زمانە زیندووەکانی جیهان،بە مەرجێك کەسانی شارەزاو شەرع زان زمان زان بە وەرگێڕانەکە هەستن و پێویستە پێش چاپ کردنیشیان لەلایەن چەند لیژنەیەکەوە پێداچونەوەی وردیان بۆ بکرێت.

**هەشتەم: پەیوەندی بەردەوامی نێوان لیژنەکانی سەر خستنی پێغەمبەر(ﷺ)و ئاگاداربونیان لە کاروچالاکیەکانی یەکتری:**

کۆنگرە داوای کرد لەپێناو سەرکەوتنی هەڵمەتەکانی بەرگری کردن لەپێغەمبەر (ﷺ)، پێویستە بەردەوام بەشدار بووانی ئەو هەڵمەتانە پەیوەندییان بەیەکەوە هەبێت و لەو ڕووەوە کۆنگرەیان بۆ ساز بکرێت و، لە هەموو جیهانەوە کەسایەتیە موسڵمانەکانی بۆ بانگهێشت بکرێت بەتایبەت لە ڕۆژئاواوە، وە سوود لە پێشنیارەکانیان وەربگیرێت.

**نۆیەم: کۆنگرە بەرگری کردن لەپێغەمبەر (ﷺ) بە ئەرکی سەر شانی هەموو موسڵمانان دەزانێت:**

کۆنگرە داوای کرد هەموو موسڵمانان بەپێی توانای خۆیان هەوڵ بدەن بۆ سەرخستنی هەڵمەتەکانی بەرگری کردن لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، هەمان کات کار بکەن لەپێناو بەهێزکردنی ئوممەتەکەمان دا، کۆنگرە داوای لەلاوان و ئافرەتان کرد کە ڕۆڵی خۆیان بگێڕن لە بەرگری کردن لە پێغەمبەری خوادا (ﷺ) و، هەروەها داوای لە دەوڵەتە ئیسلامیەکانیش کرد لەو هەڵمەتانەدا بەشدار بن.

**دەیەم: ئەنجام دانی چاو پێکەوتنی تایبەت :**

کۆنگرە داوای بەستنی چاوپێکەوتنی تایبەتمەندی کرد لە هەموو بوارەکان دا بۆ بەرگری کردن لە پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەها داوای کرد ئەهلی زانستی شەرعی بەشداری کارایان هەبێت و چاوپێکەوتنەکانیش لەگەڵ ئەم چینانە دا ئەنجام بدرێن.

أ- ئەنجام دانی چاوپێکەوتن لەگەڵ لایەنی دادوەری و یاسایی داو، داوایان لێ بکرێت کە یاسایەك دابنێن بە مەبەستی سزادانی ئەو کەسانەی بێ ڕێزی بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکەن لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا، هەروەها ئەوانەیش لە وڵاتانی ئیسلامیەوە بەو کارە هەڵدەستن بەتوندی سزا بدرێن و لەو ڕووانگەوە دەستەیەك دابمەزرێت.

ب- چاوپێکەوتن لەگەڵ پیاوانی ڕاگەیاندنداو داوایان لێ بکرێت ، کەناڵی ئاسمانی تایبەت بە هەموو زمانە جیاوازەکانی دونیا دابمەزرێنن وهەمان کات بەرنامەی

پێشکەوتوو پێشکەش بکەن،وە هەوڵ بدەن سوود لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن وەربگرن بۆ بانگ کردنی خەڵکی بۆ لای ئاینی خوا.

ج.-ئەنجام دانی چاوپێکەوتن لەگەڵ هەموو لیژنەکانی بەرگری کردن لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ولەو ڕووانگەوە بڕیاری پێویست بگرنە بەرو بەردەوام هاوکاری لەنێوانیاندا هەبێت.

**پانزەیەم: پشت بەستن بە خوای پەروەدگار:**

کۆنگرە داوای لە سەرجەم موسڵمانان کرد،کە پشت بە خوای پەروەدگار ببەستن هەتا دەرگای خێریان لێ بکرێتەوە و ،پەروەردگار کێشەکانیان چارەسەر بکات، بێ گومان ئەوەی لەسەر ئوممەت بێت پێویستی گەڕانەوەیانە بۆ لای پەروەردگارەکەیان و پشت بەستنی موسڵمانان بە زاتی پیرۆزی ،پێویستە لەو کارانە پەشیمان ببنەوە کە پێچەوانەی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرن (ﷺ)، چونکە ئوممەت تەنها کارکردنی دڵسۆزانەی لەسەر شانەو هەمووان لە پەروەردگار بپاڕێینەوە کە ئوممەتەکەمان لەم دۆخە ڕزگار بکات و دوژمنەکانمان سەرشۆڕ بکات و عیززەت و سەرکەوتن ببەخشێتەوە بە ئیسلام و موسڵمانان.

لە ڕۆژی ٢٠١٠/٦/٣٠ دەستم کرد بە وەرگێڕانی ئەم کتێبەو

سوپاس بۆ خوای پەروەردگار لە ٢٠١٠/٩/٢ بەرامبەر - ٢٣/ (ڕەمەزان) ی/ ١٤٣١

کۆچی کۆتایی بە وەرگێڕانەکەم هات!

ناونیشانی وەرگێڕ:

Kashma@yahoo.com

ژمارەی مۆبایل:٠٧٥٠١١١٦٣١٨

# ناوەڕۆك